خودانێ ئیمتیازێ
حافظ قاضي

سەرنڤیسەر
مؤيد طيب





- ژمارا وەشانێ: (١٣٣)
- ناڤێ پەرتووکێ: ٢٠٠٠ پەند ژ جیهانێ
- بەرهەڤکرن و کۆمکرن: جگەرسۆز پێندرۆیی
- دەرهێنانا هونەری: حسين صنعان مەتیخان
- بەرگ: بەیار جميل
- سەرپەرشتکارێ چاپێ: زاگرۆس مەحموود
- چاپا ئێکێ
- تیراژ: (٧٠٠) دانە
- ژمارا سپاردنێ: (٢٤) ل سالا ٢٠٠٥
- چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ — هەولێر



ئەدرێس
کوردستانا عێراقێ — دهۆك
ئاڤاهیێ ئێکەتیا سەندیکایێن
کرێکارێن کوردستانێ
قاتێ سێیەم
تەلەفۆن: ٧٢٢٥٣٧٦ — ٧٢٢٢١٢٥

www.spirez.org
www.spirezpage.net



SPIREZ PRESS & PUBLISHER

دار سپیرێز للطباعة والنشر

# ٢٠٠٠
# پەند ژ جیهانێ


**بەرهەڤکرن و کۆمکرن**
**جگەرسۆز پێندرۆیی**



سپیرێز
2005

# ناڤەروك

# پێشگۆتن

هەلبەت هەر گەل و وەلاتەکێ ڤێ جیهانا پان و بەرین خودانێ کەلتوورو فەرهەنگ و کەلەپوورو رەوشەنبیری و شارستانیەتا خۆیەو بێدەرا وی یا تەژی ڤەرێژە.

خالەکا هەپشك و دیار دناڤ هەمی ملەتاندا هەیە، ئەو ژی بەهرمەند بوونە ژ کلتوورێن هەڤ وە مفا وەرگرتنە ژ بیروباوەرو ڤەرێژێن هزری و هۆنەری و تورەیی و زانستی ل ملەتەکی ژ بۆ ملەتەکێ دی، هەمی چاخ و سەردەما ژی ئەڤ بێدەرا هزرییا تە ژی کاکل ژێدەرەکێ بۆ شێ رەوشەنبیرکرن و تێگەهاندن و پێگەهاندنا کەت و کۆم و ئەندام و تەخێن جڤاکێن مرۆڤایەتیێ بوویە.

لەوما ئەڤ چەندە ب ئاوایەکی بەربەلاڤ د ناڤ هەمی جڤاکان دا دهێتە دیتن. ئانکو هەر بەرهەمەکێ هزری و زانستی ب پێکۆل و بەرخودانا هەر زاناو ملەتەکی دڤادا ژیانێ دا هاتبێتە ئافراندن، یان بەرهەمی سەربۆرو جەرباندنا بیت، ئەو ب دەستکەفتەکێ هەمی جیهانا مرۆڤایەتیێ دهێتە هژمارتن، چونکە ب حوکمێ ب هەڤراژیانا ملەتان ئەڤ دان و ستاندن و کارتێکرن هەبووینەو هەنە.

ژ بەرڤێ ئێکێ من ب فەر زانی (٢٠٠٠) پەندا ژپەندێت زاناو گەلێن جیهانێ بەرهەڤ بکەم و دناڤ ڤێ پەرتووکێ دا بناڤێ (هنگڤینێ پەندا) کۆمبکەم و بێخمە بەردەستێ خویندەڤانێن هێژاو بەرکەفتی.

هیڤی دارم تام و چێژەکا خۆش و باش ژ هنگڤینێ شرینێ ڤان پەندان وەرگرن و بکەنە گوهارو بکەنە گوهێن خۆ دا بەرپەرێن رۆژژمێرا بەختێ هەوە هەر گاڤ سپی و زەلال بن.

هێژایان ناهێته ماندەل کرن پەندێن زاناو گەلان هەمی گاڤا دشەڤستانێن تبل چاڤ و تاری و رەش دا شەمالك و خەتیرێن گەش و هەلکرینە، دەرمانێ دەردو کولانە، ڤەکەوینەرێن برینانە، داڤێن راچاندنا تەڤنێ زانینێ نە، ئەڤین و بهارێن دلانە، خەملا نێرگزو گولانە، وەرکازو گۆپالێن سقەت و شلانە، ئاوازێن پڕ خۆشێن شالویل و بلبلانە، هێزو شیانا زەندو ملانە، ڤەرێژو بەرهەمێ هزرو دەست و پلانە. لەوما ئەگەر پرانیا ڤان گۆتن و پەندان ب ئاڤا زێری و زیڤی بهێنە نڤیسین هەر کێمە. ژ بەرکو ب ڤان پەندا زۆر گرێێن عاسێ و ئالۆز دهێتە ڤەکرن و گەلەك ئاریشە دهێنە چارە سەرکرن و زۆر بەربەست و ئاستەنگ دشۆپا ژیانێدا دهێنە راکرن و هەلگرتن.

ل دیماهیکێ دا هەژی یە بێژم ژ بۆ کۆمکرنا بەرهەمێ ڤێ بێدەرێ من ل دەرگەهێ چەندین ژێدەران دایە، ژوان پەرتووکا: (رهنمون) بەرهەڤکرنا (غلام محسن زو الفقاری) پەرتووکا (در جستوجوی خوشبختی) نڤیسینا (لورد ئاڤیبوری) پاچڤەکرنا (ابو القاسم پاینده)، پەرتووکا (پند پیشینیان) بەرگێ ئێکێ بەرهەڤکرنا (سید عبدالحمید حیرت سجادی). هەروەسا پڕ ب دل سۆپاسیا هێژایان شریف سلیم و محمد عەلی سعید دکەم کو ب دلسۆزیڤە هاریکاریا من کری ژ بۆ کۆمکرنا ژێدەرێن ڤێ پەرتووکێ، هەروەسا زۆرسۆپاسیا هێژا جمال فقی یزدین دکەم کو هەلەو شاشیێن وێ لسەر کامپیۆتەرێ راست کریەڤە. ژهەژی گۆتنێ یە خودانێن هندەك پەندو گۆتنا نەهاتینە ناسکرن لەوما نیشانێ (؟) ژ بۆ وان پەندان هاتیە دانان. ڤێجا هیڤی دارم کاریبم ب کارێ خۆیێ بچیك خزمەتا پەرتووکخانا کوردی و خویندەڤانێن کورد بکەم.

# پەند

پارزینێ مەژی ژ پەندا پڕ کەن
جامێ زانینێ ڤەخوون و فڕکەن
پەند خڕ وانەنە بۆ کەسێن زانا
دەرمانن ژ بۆ برین و ژانا
هوین ب کلیلا هنگڤینێ پەندا
ڤەکەن دەرگەهێ زیندان و بەندا
ئەڤ پەندو گۆتن هەمی سەربۆرن
حیکمەت و زانین ل ناڤ دا زۆرن
بۆ شەڤێن تاری چراو خەتیرن
دۆستێن مرۆڤێ عاقل و ژیرن
گول و نێرگزن بۆ باغێ ژینێ
سەرۆکانینە بۆ سۆزو ڤینێ
ئەڤە بۆ هەمیا شیرەت و پەندن
شرینن میا شەکرو قەندن
هنگڤینێ پەندا خەزینەو گەنجە
هەڤالەك باشە، دۆستەکێ قەنجە
دێ بۆ وەکەتن کارو خزمەتێ
ڤەخوینن هەتا ژ دەستێ وەتێ
بۆ هۆش و هزرا ئەو هێزو تێنە
گەلەك مزگینی بۆ هەوە ڤێنە

**جگەر سۆز پێندرۆیی**
**هەولێر ٢٠٠٥**

# ئازادی

- ئازادی ب کەسەکی ڤە یا گرێدای نییە، ئازادی یا هەمی کەسایە. **(هربوت ئسپنسر)**
- ئازادیا راستین ئەو نییە کو هەر تشتێ ئەم حەژێدکەین ئەنجام بدەین، بەلکێ ئەوە کو ژ تو خیبێ ماڤێ خۆ دەرنەکەڤین. **(ڤیکتور کوزن)**
- ئازادی بەس د جیهانا خیالێ دا هەیە. **(شیلەر)**
- ئازادیا مە ژ خالەکێ دەست پێ دکەت کو ئازادیا کەسێن دی ب دیماهیک بهێت. **(هوگۆ)**
- بتنێ ئازادی یە بهایێ گرانێ دیرۆکێ. **(ئالبرکامو)**
- ئەو کەسێ ب سەر نەفسا خۆدا یێ زال نەبیت یێ ئازاد نییە. **(ئپیکتوس)**
- ئەگەر ئازادی هەبیت، پیرەمێر ژی دێ بیتە مێرخاس. **(پەندا هنگارییە)**
- نەبوونا ئازادیێ باشترە ژ بەردانا هەڤساریێ ئازادیێ. **(پەندەکا رۆسییە)**
- ئەی ئازادی چەند ڤەترمە ب ناڤێ تە دهێنە کرن. **(مادام رولانە)**
- ئەی ئازادی جهێ داخێ یە ژ دل دبێژم مرۆڤ یێ ژ هەژی تەنییە. **(تۆرگەر)**
- هەتا مرۆڤ تەپەسەریێ نەبینیت، هەست ب تام و خۆشیا ئازادیێ ناکەت. **(پەندا کوردییە)**
- ئەو مللەتێ تشتەکی پێش ئازادیێ بێخیت، دێ هەمی تشتەکی ژ دەست دەتن. **(سامرست موئەم)**

- مەزنترین شانازیا وی نەتەوەیٚ ب ئازادی هاتیە سەر دۆنیاییٚ ئەوە کو ویٚ ئازاییٚ بگەهینتە زارۆکێن خۆ. **(؟)**

- یان بهێلن ب ئازادی بژیم، یان بمرم. **(پۆل هانری)**

- دارا ئازادییٚ دیٚ ب خوینا شەهیدێن خۆ هێتە ئاڤدان. **(برتراند باوەر)**

- ل هەر جهەکیٚ قەدریٚ زێری و ئازادییٚ نەهاتە زانین ژوێریٚ برەڤن. **(پەندەکا ئەلمانییە)**

- مللەت دبن سبەرا ئازادییٚ دا تێدگەهیت و پێدگەهیت نەك بەروڤاژی. **(شاو)**

- ئەو مرۆڤێن دژی ئازادیا کەسێن دی رادوەستن ژ هەژی ئازادییٚ نینە. **(لینکلن)**

- ئەو کەس ژ هەژی ئازادییٚ یە کو هەر رۆژ ب کاریت ب سەر هەواو هەوەسێن خۆدا زال ببیت. **(گوتە)**

- پیرۆزترین تشت بۆ مرۆڤی ساخلەمیا جانی، هۆشی، ڤیان و ئازادیا بیٚ مەرجە. **(چیخۆف)**

- کەسیٚ کو سەخمەراتی پاراستنا جانیٚ خۆ چاڤپۆشییٚ ل ئازادیٚ دکەت ژ هەژی ئازادییٚ نییە. **(فرانکلین)**

- ئەو مللەتیٚ ئازادییٚ ژ مللەتەکیٚ دی دستینیت چ جارا ژ نیعمەتا ئازادییٚ بیٚ بەهرمەند نییە. **(چرنیشفسکی)**

- رامانا دروستا ئازادییٚ بەر پرسیاریەتییە، لەورا بارا پتر ژیٚ دترسن. **(شاو)**

- چاخیٚ رهێن شتلا ئازادییٚ چوونە خاریٚ دیٚ بلەز گەشەو وەراریٚ کەتن. **(ژورژ وا شنتون)**

- پێدڤی یە هەر ئێك ژ ئالیٚ خۆڤە پێکۆلیٚ بکەت د ژیانا خۆدا بەرەکیٚ موکم بۆ چێکرنا شەنگستیٚ قەسرا ئازادییٚ دانیت. **(ئسپرت سیسیل)**

- قەفەس چقاس تەنگتر بیت ئازادی شرینترە. **(پەندا ئەلمانی)**

- چ هێزەك وەك مەیلا مرۆڤی بۆ ئازادییٚ یا خۆرت نییە. **(؟)**

- ل هەر جهەکی دۆ کەس لێبن ئێکێ دەست هەلات دارە ئێکێ تەپەسەر. **(حیجازی)**
- ئەگەر ئەم حەژ ئازادیێ نەکەین ئەم نکارین نانێ ئازادیێ بخۆین، وە ئەگەر بخۆین ژی مە پێ ناهێتە حەلکرن. **(گاندی)**
- مرۆڤ ب ئازادی پێ هاتیە ئافراندن لێ دناڤ قەیدو بەندا دا ژ دایك دبیت. **(فیللەر)**
- ئەگەر دناڤ جانێ کەسەکی دا هەستا سەربەست بوونێ نەبیت نکاریت ب ئازادی بژیت. **(حلمی چیاو)**
- ئازادیا زێدەو بێ قەیدو مەرج ژنا باش ژی دێ گەنیکەت. **(پەندەکا رۆسی یە)**
- هەتا ئازادی و ساخلەمیێ ژ دەست نەدەین ئەم قەدرێ وان نزانین. **(ڤالتور)**
- ئازادی مەزنترین بەهرەیە ب مرۆڤان هاتیە بەخشین. **(ئپیکتۆس)**
- بۆ هندێ ئەم ژ داڤا تەپەسەرێ قورتا ببین، گەرەکە پێگریێ ب یاسای ڤە بکەین. **(سیسرون)**
- مرۆڤ ل وی چاخێ پێکۆلێ دکەت ئازاد ببیت یێ ئازادە. **(ڤولتەر)**
- ژیان هنگی دێ ژ بەختەوەریێ یا بەهرەمەند بیت کو دگەل ئازادیا هزرێ یا ب هەڤرابیت. **(ڤیکتی بووم)**
- لەشێ تە بەس بۆ ئازادیاتە نییە. **(حکمەت هندو)**
- ئازادیا کەسێ نەفام و زارۆکێ نەزان دێ بیتە ئەگەرا ژ ناڤچوونا وان. **(محمد مسعود)**
- ئازادی ناهێتە خارێ دڤێت مرۆڤ بۆ ژێهەل بچیت. **(؟)**

# ئاخڤتن

- ئەوێ دەست هەلات ب سەر زمانێ خۆدا هەبیت یێ ئەمینە. **(عەلی کورێ ئەبی تالب) خودێ ژێ رازی بیت**
- ئەو تشتێ ئەم  خراپ لێ تێدگەهین نکارین باش بەیان بکەین. **(بۆئالۆ)**
- ئەگەر تەبڤێت ژتە باوەر بکەن پەسنا (مدح) خۆ نەکە. **(پاسکال)**
- ئەوێ د ئاخڤیت دچینیت وە ئەوێ گوهددەتێ ددرویت. **(پەندا ڤاتۆیا)**
- وەسا ژ گێنگەشێ بڕەڤە هەر وەکی چاوا ژ مارەکێ خودان ژەهر یان بیبەلەرزەکا ترسینەر دڕەڤی. **(دیل کارەنگی)**
- ئەگەر خەلك ژ زمان و نیازا هەڤدو گەهیشتبانە دا ناکۆکی و هەڤدژی دناڤبەرا وانادا رابن. **(گۆتە)**
- ئەگەر تەبڤێت ئێك ببیتە هەڤبیرو هەڤباوەرێ تە بهێلە ب ئازادی باخڤیت. **(دیل کارەنگی)**
- هزر بکەینەڤە کا چ ببێژین باشترە ژ پشێمان بوونەڤێ کا بۆچی مە گۆت. **(سەعدی. ش)**
- بهایێ گۆتنەکا دلسۆزانە پترە ژ دۆ سویندا. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- ئەگەر ئاخڤتن کەفتە زارەکی دێ کەڤیتە شارەکی. **(پەندەکا کوردییە)**
- نەهێلە زمانێ تە حەفکاتە ژێڤەکەت. **(؟)**
- ئەگەر تەبڤێت دەستێ تەیێ کورت بیت بلا زمانێ تە یێ درێژ بیت. **(؟)**

- نـەزان ب دۆتشـتا دهێتـە نیاسـین، یـا ئێكـێ چاخێ د ئاخڤیـت بـەری ژێ بهێتە پرسـین، یـا دوویـێ ژی چاخێ زێـدە ژ ئەنـدازێ پێـدڤی دئاخڤیـت. **(ئەفلاتون)**

- نەهێلن زمانێ هەوە پێش هزرێن هەوە بكەڤیت. **(شیلون)**

- چ جارا بەری هزر كرنەڤێ نەئاخڤەو چ كارەكی نەكە. **(فیساغۆرس)**

- هەمی كەسا گوهێن گوهلێبوونا راستیێ ڤێنینە. **(تەوفیق حەكیم)**

- چێدبیتە ڤە جهێ خەنجەرا، لێ چێنابیتە ڤـە جهێ خەبـەرا. **(پەنـدەكا كوردییە)**

- یان دروست باخڤە یان ژیرانە خۆ كرِ بكە. **(ژورژ هوربوت)**

- هەركەسـێ یـا دلـێ وی بڤێـت بێـژیت، دێ ئـەو چـەندا نـە ژدلـێ خـۆ گوهلێبیت. **(پەندەكا توركییە)**

- بابـەتێ پـەیڤینێ هـەر چ بـیتن پێدڤییـە بزانـی، تـۆ دگـەل كـێ دپـەیڤی. **(پاسكال)**

- پەیڤەكا د جهێ خۆدا چێدبیت ببیتە كلیلا سەركەفتنێ. **(غ. ژ)**

- پەیڤـەكا زڤـرو هـەرِمی چـێدبیت ببیتـە سـەدەمێ چـێبوونا ڤەترمـەكێ. **(غ. ژ)**

- پەیڤەكا جوان چێدبیت دۆستەكێ دلۆڤان چێكەت. **(غ. ژ)**

- هەركەسـێ زۆر باخڤیـت دێ زۆر شاشـیاكەت. **(عـەلی كـورِێ ئـەبی تالـب) خودێ ژێ رِازی بیت**

- ئەو كەسێ نـەزانیت باخڤیـت نزانیـت ژی یـێ بـێ دەنـگ بیـت. **(پەنـدەكا عەرەبییە)**

- كـێم زانــین و زێــدە ئــاخڤتن وەكــی نــەداریێ و زێــدە مــەزاختنێ یــە. **(ناپلیۆن)**

- ئەو كەسێ شارەزای زمان لویسیێ بیت بۆختان ب یێن دی كـرن بـۆ وی یـا ب ساناهییە. **(ناپلیۆن)**

- گۆتنا تەحل ژ دلەکێ تەحل دەردکەڤیت. **(پەندەکا سویسرییە)**
- زمـان یـێ دڕندەیـە ئەگـەر بەرئـەللا بکـەی دێ تـە خـۆتن. **(پەنـدەکا عەرەبییە)**
- زمانی هەستی نییە، لێ ب ساناهی هەستی دشکێنیت. **(پەندەکا تورکییە)**
- زمان باشترین و خراپترین تشتێ دونیایێ یە. **(ئوزۆپ)**
- زمان پتر ژ دلی گۆلی دکەتە مرۆڤی. **(دیسرافیلی)**
- زمان مینا ئاژەڵەکا کویڤییە ئەگەر تە بەرەلاکر زەحمەتە بکاری بگریەڤە. **(پەندەکا لاتینییە)**
- بـەس زمانـە ئـەو ئـامیرێ تیـژ ئـەوێ ب پـتر دانـە شـۆلێ تیـژتر لێـدهێت. **(واشنتۆن ئیروینگ)**
- ئاخفتن رەنگە پێدڤیەکە لێ گوهلێگرتن هۆنەرە. **(گۆتە)**
- رهێن حیکمەت و زانینێ یێن دناڤ دلـی داو فێقیـێ وێ یـێ دنـاڤ دەڤـی دا. **(بتلیموس)**
- تشتەکی بێژە کو گۆتنا وێ باشتر بیت ژ نەگۆتنێ. **(دیل کارەنگی)**
- پەیڤا خۆش دەرگەهێن ئاسنین ڤەدکەت. **(پەندەکا یوگسلافییە)**
- ب قەسا خۆش مار ژ کونێ دهێتە دەرێ. **(پەندەکا کوردیی)**
- پڕ بێژی و زێدەگۆتن دەرفەتا هزرینێ و ژیریێ ژ مرۆڤی دستینیت. **(دیل کارەنگی)**
- پەیڤێن شرین چ زەحمەت تێدا نینـە، لـێ زۆر مفـاییێن تێداهـەی. **(جۆرج هیربرت)**
- ئەو نەیارێ قەسە شرین بیت شیرێ وی تیژترە. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- چـێدبیت بەرهـەمێ پـەیڤا دلحـەبین کـو ئـیرو دبێـژی سـبەهی تامکـەیێ. **(گاندی)**

- بەری پەیڤینێ فەرە حەفت جارا زمانێ خۆ دناڤ دە ڤێ خۆدا بینی و ببەی. **(پەندەکا فەرەنسییە)**

- مرۆڤ چقاس ئاخفتنا داعویریت مەعیدا مرۆڤی دووچارێ خراپ هەرسکرنێ نابیت. **(چەرچل)**

- رێکێ نەدە زمانێ خۆ بەری هزرکرنەڤێ بڕێبکەڤیت. **(شیلۆن)**

- دۆ پەیڤێن (بەلێ ونە) کو گۆتنا وانا یا ب ساناهییە بۆ بکارئینانا وانا هزر کرنەڤەو ڤەخویندنەکا زۆر دڤێت. **(؟)**

- ب دەڤی کویرە دهێتە شاراندن. **(پەندەکا کەڤنارە)**

- گۆتنەکا پیڤای و کێشای چێدبیت ببیتە پەندەکا مەزن بۆ وانە ژێوەرگرتنێ. **(غ. ژ)**

# ئومێد و هیڤی

- ئەو کەسێ ئومێدێ ژ دەست بدەت دێ گەلەك تشتا ژ دەست دەتن. **(پەندا ئەسپانییە)**
- خۆ ژ هیڤی و ئومێدیێن دویرو درێژ دویر بێخن، چونکی ژبلی ماندیکرنا جانێ هەوەو بێزارکرنا هزرا هەوە هوین چ سوودو فازانجەکی ژێوەر ناگرن. **(ڤلتەر)**
- ژ دەست دانا هیڤی و ئومێدەکا پویچ کو مسۆگەر نەهێتە بجهئینان خۆ ب خۆ سەرکەفتن و پێشکەفتنەکا مەزنە. **(شکسبیر)**
- هزرێن باش ئەندازیارو ئافرندەنە، هیڤی و ئومێد غەرغەرەکە هەمی تشتا بۆ ئالێ خۆ رادکێشیت. **(دیل کارنگی)**
- ئەگەر جارەکی پلەو پایێ تە هاتە خارێ بێ ئومێد نەبە، چونکی رۆژ هەمی رۆژا چاخێ ئاڤابوونێ نەڤی دبیت، دا ل ئەلندا رۆژا پاشتر بهەلێت. **(ئەفلاتوون)**
- ئەگەر تە بڤێت یێ بەختەوەر بی ژ بلی ئەو چەندا دەست تە دکەڤیت زێدتر نەخازە. **(لارشفوگولە)**
- ئەو کەسێ بۆ گەهیشتن ب ئومێدا خۆ گاڤا پاڤێژیت، هەر گاڤ هەست ب تام و خۆشیێ دکەت. (؟)
- ئومێد نانێ رۆژانەیێ مرۆڤانە. **(تاگوور)**
- ئومێد دایکا باوەرێیە.**(لاندور)**
- چاوا پەرا بۆ بالندا بهاو گرنگی هەیە، وەسا ژی ئومێد بۆ ژیانێ یا بهادارو گرنگە. **(هۆگۆ)**

- ئومێد نیڤەکا بەختەوەریێیە. **(پەندەکا تورکی)**
- ئومێد خارنا رۆژانەیا بەلەنگازایە. **(هرشل)**
- ژیانا بێ ئومێد هەڤ رێڤینگە دگەل مرنێ. **(اعتصام الملك)**
- خۆڕاگری بناغێ ئومێدێیە، ئومێد ژی کلیلا بەختەوەریێیە. **(ئیرانشهر)**
- زۆر ژیان ئومێدا هەمێ کەسایە، لێ باش ژین ئارمانجا کێمایە. **(ج. هیوز)**
- خەلکێ تەپەسەرو بەخت رەش ژ بلی ئومێدێ خودانێن چ تشتەکێ دی نینە. **(شکسبیر)**
- بێ ئومێد بوون پێتگاڤا ئێکێ یە کو مرۆڤ بەرەڤ گوڕی دهاڤێژیت. **(ناپلیۆن)**
- دگەل هەمی وان سەرکەفتیێن من ب دەستڤە ئینای ئەز هەر قەرداری وان ئومێدامە ئەوێن ل چاخێ تولازیێ من دناڤ دەروونێ خۆدا پێگەهاندی. **(ناپلیۆن)**
- هەرچقاس هیڤی و ئومێدێن هەوە کێمتر بن، دێ بێ پارییێن هەوە ژی کێمتر بن. **(پلوتارگ)**
- پێدڤی یە هەر گاڤ ب راستی بژین، نە ب هزرو خیالا. **(مری ئستوارت)**
- ئەو کەسێ ب هیڤیا ئومێدا بژیت رەنگە ژ برسا دا بمریت. **(فرانکلین)**
- ئەو کەسێ بەراهیکا خۆ نەبینیت دێ ڤەمینیت. **(؟)**
- تەکەرێن ژەنگ گرتیێن ژیانێ ب دەستێن نەپەنێن ئومێدێ دزڤڕن. **(د. ناصرالدین)**
- ئەگەر خەوو ئومێد ژ مرۆڤی بهێنە ستاندن، دێ بیتە بەخت رەش ترین کەسێ سەر عەردی. **(کانت)**
- ئەو هیڤی و ئومێد یا عاقلانەیە ئەوا ب دیڤ دەستێ مەڤە دهێت. **(حیجازی)**
- باشترین بناسە بۆ سەرکەفتنێ ئومێدەواربوونە، ڤێجا ئەگەر وەلبەرە سەر بکەڤن، هیڤی داربن. **(؟)**

- زۆر جـارا وەسـا رێكدكـەڤیت سـەخمەراتی گەهیشـتن ب بەختەوەریـەكا خیالی ئەم خۆ دووچاری هزاران ئاریشا دكەین. **(ئەبو عەلا)**

- هیڤی و ئومێد بۆ مرۆڤان وەكی ئاڤێ یە بۆ ماسیێ. **(غولام رەزا)**

- رێكـا ژیـانێ یـا پـڕی ئاریشـەو ئـەڤرازی و نشـیڤی یـە، بـتنێ كەسـەك دێ كاریت دڤێ رێكا پڕ مەترسی دا دەرباز ببیت كو جانێ وی یـێ پـڕ ئومێـد بیت و بێ هیڤی بوون جهێ خۆ ل دەڤ وی پەیدا نەكەت. **(لورد ئاڤێبوری)**

- ئومێد بۆ تێنیا كانیەكە ئەگەر (هشك ببیـت، هـەمی دێ ژ تێنـادا سـۆژن. **(حیجازی)**

- دنیا ل سەر شەنگستێ ئومێـدێ یـا هاتیـە ئاڤاكرن، مـرۆڤ ژی ب ئومێـدێ یێ ساخە. **(پەندا دێهخۆدا)**

- ئەگەر خودێ ڤیـا كەسـەكی گـەنی بكـەت دێ هـەمی داخـازێن وی بـۆ جـێ بەجێ كەتن. **(ئسكار ڤایلد)**

- ئومێدا نەبیتە راستی مینا خەونەكا تەحلە. **(؟)**

- پاش كەفتنێ باشترین هێز بۆ رابوونەڤێ هیڤی و ئومێدە. **(ج. پ)**

# ئەزموون و جەڕباندن

- پێگەهاندن و تێگەهاندنێ ئەگەر جەڕباندن دگەل دا نەبیت یا بێ مفایە. **(پێیەرژانە)**
- رویڤیەکێ گەڕیایی باشترە ژ شێرەکێ نەگەڕیای. **(پەندەکا کوردییە)**
- راست نەکرنەڤا هەلەو شاشیێ ب خۆ شاشیەکا دییە. **(کنفۆسیۆس)**
- جەڕباندن ژ زانینێ بلندترە. **(ئیبن سینا)**
- مفای ژ شاشیێن خۆو کەسێن دی وەربگرن. **(بزرگ میهر)**
- ئەوێن یا بۆری نەئیننە بێراخۆ هەژی وێ هندێنە هەر ئەو چەند بهێتەڤ رێکا وان. **(ساشایانا)**
- جەڕباندن خویندنگەهەکە شاگردێن خۆ ب بهایەکێ گران پێدگەهینیت. **(فرانکلین)**
- جەڕباندن و تاقیکرنەڤە فێقیەکە ناهێتە چنین هەتا نەرزیت. **(ئەرستۆ)**
- تاقیکردنەڤە باشترین وانا ژیانێ یە، لێ حەیف بهایێ وێ یێ گرانە. **(کارلایل)**
- تاقیکردنەڤە مامۆستایەکێ توندە بەراهیکێ تاقیکردنەڤێ دکەت پاشی وانێ دبێژیت. (؟)
- شاشیکرن کارەکێ مرۆڤانەیە، لێ دووبارەکرنەڤا شایشیێ کارەکێ ئاژەلانەیە. **(ئاناتۆل فرانس)**
- دنیا ب هیمەتا گەنجان و ئەزموونێن پیران برێڤە دچیت. (؟)

- ژ هەر بیاڤەکێ ژ پیاڤێن ژیانێ دا چ مامۆستایەکێ ژێهاتی و چ سەیدایەکێ ژێزان وەکی تاقیکردنەڤێ نییە. **(لیر)**

- بەختەوەر کەسەکە کو ژ هەر شاشیەکا خۆ ئەزموونەکا تازە وەردگریت. **(سوقرات)**

- بەس چرایەکێ هەی رێکا شارەزا بوونێ بۆمن رۆناهی دکەت ئەوژی جەرباندنە. **(؟)**

- ئەو کەسێ جارەکی من ب خاپینیت بۆ وی شەرمە، لێ ئەو کەسێ دووجارا من ب خاپینیت بۆ من شەرمە. **(پەندەکا ئسکۆلەندی یە)**

- ئەو کەسێ دۆجارا ل سەر بەرەکی ب تەحسیت یێ ژ هەژی هندێ یە هەردۆ پیێن وی بشکێن. **(؟)**

- مری چاڤێن زیندیان ڤەدکەن. **(پەندەکا ئینگلیزیە)**

- فەهێتی نییە مرۆڤ شاشیێ بکەت، لێ فەهێتی ئەوە مرۆڤ هەست ب شاشیا خۆ نەکەت. **(پەندەکا رۆسییە)**

- بێ هێزترین کەس ئەوە یێ کو ژ سەر هاتی و قەومینێن رۆژگارێ پەندا وەرنەگریت. **(عەلی کوڕێ ئەبی تالّب) خودێ ژێ ڕازی بیت**

# ئەرك و كار

- ئەو كەسێن خودان حەزەكا پڕ شیان بن چ جارا دبیٚ ئەرك نینە. **(لوتەر)**
- خراپترین خەلكیٚ سەر عەردی ئەو كەسن یێن ئەركێن خۆ دزانن لیٚ ئەنجام نادەن. **(هانری مارتین)**
- ب ویٚ سۆزا تۆ ددەی قەرەكیٚ دی نە ئێخە سەر ملیٚ خۆ. **(پەندەكا ئەفریقییە)**
- هەتا تە تبل و نێنیك پێڤەنە گرییێن كاریٚ خۆ ب خۆ ڤەكە. **(؟)**
- كاریٚ ئەڤرو نەهێلە سبەهی. **(پەندەكا كوردییە)**
- كاریٚ ب وەختی وەكی پاشاییٚ سەر تەختی. **(پەندەكا كوردییە)**
- چ بەختەوەری ژ راپەڕاندنا ئەركی خۆشتر هەیە، هەروەسا چ سەر گەرمی ژ كاری باشترە؟ **(كارمن سیلۆ)**
- رازی بوونا وژدانیٚ پاشی ئەنجام دان و راپەڕاندنا ئەركییە. **(؟)**
- ئەو كاریٚ ئەرك و دلسۆزی راپەڕینن سستی ناكەڤیتیٚ. **(شكسبیر)**
- بەرخودان ئێكەمین ئەركیٚ مرۆڤییە. **(گۆتە)**
- درێیا راپەڕاندنا ئەركیٚ خۆدا بیٚ خۆڕاگربە. **(؟)**
- نابیت ئەركیٚ خیالی بچیتە جهیٚ ئەركیٚ راستین. **(وینە)**
- كیش ئەرك ژ هەمیا پتر ل تەییٚ نێزیكە وی ئەنجام بدە. **(؟)**
- هەر كەسیٚ خۆشییٚ پێش ئەركی بێخیت بیٚ ژ هەژی سەرخۆبوونیٚ نییە. **(ئادوكاسیان)**

- رێز ل کەسەکی گرتن کویێ ژ هەژی وێ رێز لێگرتنێ بیت ئەرکناسییە. **(سنبال)**
- چ جارا سەر خاترا هەڤالێ خۆ چاڤپۆشییێ ل ئەرکێ خۆنەکە. **(سن لامبەر)**
- هەر ئەرکەکێ ژبیر بکەین ئەم پەردەکێ ب سەر راستیەکێ داددەین کو پێدڤی بوو بزانین. **(دۆسکین)**
- ئەرکێ ئەڤرو ب ئەرکێ پاشەرۆژێ نەگۆڕە ، بلا ئەرکێ پاشەرۆژێ باشترو مەزنتر بیت. **(ئەرنست تاویل)**
- کەس وەکی دەستێ مرۆڤی نزانیت پشتا مرۆڤی بخۆرینیت. **(پەندەکا کوردییە)**

شۆلکەرێ خۆ بە خۆشتڤیێ خەلکی بە. **(پەندەکا کوردییە)**

# وژدان

- ئـەو كەسـێ گوهـدارێ عـەقلێ و وژدانـا خـۆ بيـت دێ كـێمتر نەچـار بيـت گوهداريا كەسێن دی بكەتن. **(محمد حيجازی)**
- شەنگستێ ژيانا مە ل سەر عەقل و وژدانـێ يـێ هاتيـە دانـان نـەك ل سـەر هەواو هەوەسێ. **(مونتن)**
- زانينا بێ وژدان وێرانييە. **(رابلە)**
- هەستا وژدانێ مەزنترين فەيلەسۆفە. **(جان جاك رۆسۆ)**
- چ مە بڤێـت يـان نـەڤێت ئـەم يـێ دبـن دەسـت هـەلاتا وژدانـی دا يـان دژی مەيە يان ب ڤازانجێ مەيە. **(لامارتين)**
- هەستا وژدانێ ئەو هێزا دادوەرانە يـا سـنجی (اخلاقـی)يـە كـو ب خـۆ خـۆ دادگايی دكەت. **(كانت)**
- ئـەی وژدان خـراپيێن مـە هـەمی ژ بـەر چاڤپۆشـی و لێبـۆرينێن تەنـە. **(محمد حيجازی)**
- زانايێ بێ وژدان چ جارا نابيتە خودانێ جانەكێ پاقژ. **(رابلە)**
- لۆمەكرنا وژدانـێ سـزايێ گونـەهێن مەيـە وە پشـێمانی باجەكـە ئـەم ژێـرا ددەين. **(لورد ئاڤيبوری)**
- كەسێ كو شەرم نەبيت وژدان ژی نييە. **(پەندەكا ئەمريكييە)**
- كەسـێ كـو وژدانـەكا پاقـژ هـەبيت دێ زوی دخـەو راچـيت. **(پەنـدەكا ئەمريكييە)**
- كەسێ كو وژدانا وی يا پاقژ بيت هەر گاڤ يێ دلشادە. **(پەندەكا چينييە)**
- زانايێ نەفسا خۆ بەو ڤوتابيێ وژداتنا خۆبە **(ئەرستۆ)**

- دهەمی رەوشەکێ دا دەنگێ وژدانێ ژ خۆ دویر نەئێخە. **(ناپلیۆن)**
- وژدان وژدان ئەی وەفادارترین دۆستا مرۆڤی. **(گرۆپ)**
- چـێدبیته ڤـە جهـێ خەنجـەرا چـێنابیتەڤە جهـێ خەبـەرا. **(پەنـدەکا کوردییە)**
- ئەگەر وژدان بریندار بوو چێنابیتەڤە. **(پەندەکا چینییە)**
- وژدانا خراپ مرۆڤی دکەتە ترسنۆك. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- وژدانا پاقژ ئستۆپێ زمانییە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- وژدان دادگەهەکە پێدڤی ب دادوەری نییە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- تەلبەرە کیڤە بچی هەرە؟ دێ ل وێرێ وژدانا خۆ بینی. **(دیدرۆ)**
- وژدانەکا باش هزار شیرا دئینیت. **(ناپلیۆن)**
- چ مـرۆڤێن تاوانبـار دهەمبـەر دادگـەها وژدانـێ دا نکـارن خـۆ بـێ گونـەه بکەن. (؟)

# ئاشتی و شەڕ

- هند قاس من شکەست خارن هەتا ئەز فێری رێگا شکاندنا دوژمـنی بـووی. **(ناپلیۆن)**
- شانازی ئەوە مرۆڤ دلۆپەکا رۆندکا هشك بکەتەڤـە نـەك لێسـەرێن خـوینێ برێژیت. **(بایرۆن)**
- ئەگەر تەمار کوشت تێشکێ ویژی بکوژە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- بۆ بەرقرار بوونا ئاشـتیێ ل جیهـانێ گەرەکـە مللـەت ل هـەڤ نێزیـك بـبن نەك دەولەت. **(ئایدەك)**
- بۆ کوشتنا پێشیێ خەنجەر پێدڤی نییە. **(پەندەکا ئەفریقیە)**
- ئەوێ نەچیتە شەڕی شیرێ وی یێ تیژە. **(پەندەکا کوردییە)**
- تڕانە دبنە مژانە. **(پەندەکا کوردییە)**
- دناڤ باغێ ئاشتیێ دا دارا بازرگانیێ بەر پێڤە دهێت (؟)
- دڤێت رێکا رەڤینێ بەری رێکا شەڕی بهێتە دیارکرن. **(ناپلیۆن)**
- شەڕ یاسایان دتە مرینیت. **(سیرون)**
- بۆ ترساندنا مشکی ئاگری بەرنەدە مالا خۆ. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- نەبە بەکرۆك دناڤبەرا دۆ کەسان دا، چونکی ئەگەر ئەو پێك هاتنەڤـە تـۆ دێ شەرمەزاربی. **(سەعدی شیرازی)**
- رۆژگـارەك دێ هێـت بـێ شـەڕو تـۆپ و نیـزە سـەرکەفتن دێ ب دەسـت ڤەهێت. **(ناپلیۆن)**
- باشترین بەرەڤانی کرن هێرش برنە. (؟)

- ژیان شەڕە دناڤبەرا حەزو ئەرکادا ڤێجا ڤی شەڕی فێری زارۆکێن خۆ بکەن. (؟)
- بناغێ هەمی شەڕا سێ تشتن زێر، ژن، عەرد. **(پەندەکا هندییە)**
- زێڕ کانزایەکێ تاوانبارە، چونکی ب درێژیا دیرۆکێ ئەڤ هەمی خوینە سەخمەراتی وێ یا هاتیە رێتن. (؟)
- ئەو کەسێ نەشێتە مێرییێ ژ قەستا دچیتە شەڕێ فیلی. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- قادا (میدان) شەڕی دەلیڤا ڤەخاندنێ نادەتە کەس، ڤێجا هەر کەسەك چ دزانیت بلا بکاربینیت. **(جواهر لەعل نەهرو)**
- کەسێ دوراندی پتر خازیارێ شەڕییە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- ئەرکێ پاراستنا ئاشتییێ گرنگترە ژ رێڤەبرنا شەڕی. (؟)
- نەیارێ دوژمنێ مرۆڤی دۆستێ مرۆڤییە. (؟)
- راستە شەڕی مرنا تێڕا دیارە، لێ ئەگەر ڤەگەڕێینە ڤە شەرمەزاریا ل پشت مە. **(متر لینگ)**
- ئەو کەسێ د شەڕی دا پشتا خۆی بشانسی گرێ دەت ژ هەمیا هەژیترە. **(فردیکێ مەزن)**
- ئەگەر کەسەك نەزانیت با خڤیت نابیت گێنگەشە دگەل دا بهێتە کرن. **(سوقراتی حەکیم)**
- ئەگەر ل جیاتی چەکی مە مامۆستا بربانە شەڕێ دونیایێ هەمی دوژمن دا ژناڤچن. **(بیمارك)**

# بەختەوەری

- چێدبیت سەخمەراتی بەختەوەر بوونێ خۆ دووچاری هزار نەگبەتی و بەدبەختیان بکەین. **(رۆسۆ)**
- هۆ خەلکینە چما هوین ل دەرڤە ل بەختەوەریێ دگەڕێین بەختەوەری یا دناڤ هناڤێن هەوەدا؟ **(بیو ئیوس)**
- بۆ بەختەوەر بوونێ ئیروویە نەك سبەهی. **(جیمز بادید)**
- بەختەوەرترین کەس ئەوە یێ بزانیت بۆچی هاتیە سەر دونیایێ و دێ کیڤە چیت. **(؟)**
- بەختەوەری ب کارو مێرخاسیێڤە یا گرێدایە. **(بالزاك)**
- بەختەوەر ئەو کەسە یێ هەمبەر هێرشا نەخۆشیا خۆ نەدوڕینیت. **(پاسکال)**
- بەختەوەر ئەو کەسە یێ ب نەخۆشیێن ژیانێ بگرِنژیت. **(شکسبیر)**
- بەختەوەریا کەسێن دی پشکەکا گرنگە ژ بەختەوەریا مە. **(کلبەر)**
- بەختەوەری ئەنجامێ ژیانەکا عاقلانەیە. **(ئەسبی تۆزا)**
- بەختەوەریا جڤاکێ ژ بەختەوەریا کەتێ گرنگترە. **(؟)**
- گولا بێ ئاڤ نا بشکڤیت وە بەختەوەری بێ ڤیان نابیت. **(ماکسیم گورگی)**
- منێ دیتی پلا بەختەوەریا کەسان یا گرێدایە ب خاست و حەزا وان ڤە. **(لینکلن)**
- ئەو کەسێ ل دیڤ خێرو بەختەوەریا کەسێن دی بگەڕێیت د ئەنجام دا دێ بەختەوەریا خۆ ژی دەست خۆڤە ئینیت. **(ئەفلاتون)**

# بەخشین و لێبۆرین

- ژ ئـەفلاتۆن هاتـە پرسـین دێ چاوا كـارین تـۆلێ ژ دوژمـنێ خـۆ ڤەكـەین گۆتی ب قەنجی و جوامێریێ. **(ئەفلاتون)**
- ژ ئـەركێن مەردایـەتیێ چـاڤ پۆشـییە ل عـوزرا گونـەهكاران. **(قـابۆس چشمگیر)**
- چاڤپۆشی ل گۆتنەكێ كرن هندەك جارا هندی سینگێ خۆ كرنە مەتال بۆ گوللەی فیداكاری و قوربانییە. **(حیجازی)**
- ئەو كەسێن نەكارن ل كەسێن دی ببۆرن وان پێپـەلانكا خـراپ دكـەن یـێن كو پێدڤی یە لێ سەر بكەتن. **(هربرت ئسپنسەر)**
- ژ جوامێرەكێ هاتە پرسین مەردایـەتی باشـترە یـان زیرەكـی گـۆتی ئـەوێ مەرد بیت وی چ پێویستی ب زیرەكیێ یە. **(سەعدی شیرازی)**
- دان (اعــتراف) ب شیاشــیا خــۆ دانــان نیڤــەكا بــۆرینێ یــە. **(پەنــدەكا فەرەنسییە)**
- خەلات مێریا پیێ كو لی یە. **(پەندەكا فارسییە)**
- بـۆ دوژمـنێن خـۆ هنـدقاس كـویرێ گـەرم نەكـە كوتـە ژی ب شـەوتینیت. **(شكسبیر)**
- خەلات چقاس یێ بچیك بیت دێ ئاگرێ تورە بوونێ نە ڤی كەتن. **(؟)**
- بەرزترین خەلات ئەوە تۆ ماڤێ خودانی بدەیەڤێ **(عەلی كورێ ئەبی تالب)** خودێ ژێ ڕازی بیت
- باشترین تۆلەڤەكرن ژ بیركرن و بۆرینە. **(جۆنس)**
- بۆرینا پاشی سەركەفتنێ ژ رەوشت بەرزیێ یە. **(؟)**

- عـوزر خـازى و داخـازا لێبـوٚرينێ كـرن بەلگەيـەك ل سـەر هوٚشمەنـديێ. **(عەلى كورێ ئەبى تالب)**
- زانستەكێ تڤاڤ يێ پێدڤى بەخشينەكا تڤاڤە. **(ديل كارەنگى)**
- مروٚڤێ مەرد يێ خوٚشتڤييە بلايێ هەژار بيت. **(ئەرستوٚ)**
- مەردايەتى نە يـا ب زێدەدانێ يـە، بـەلكى يـا ب هنـدێ يـە دچاخێ خـوٚدا بدەى. **(لابرويەر)**
- شەڕ شەڕى ژ ناڤ نابەت. **(پەندەكا لاتينييە)**
- بوٚرين لچاخێ ژێهاتنێ نيشانێ زيرەكيێيە. **(بوٚ عەلى سينا)**
- بوٚرين ژ گونەهێ توٚلە ڤەكرنەكا دجهێ خوٚدايە. **(ديل كارەنگى)**
- بوٚرين يا كەسێن ڤەنجە كو دكارن توٚ لا خوٚ ڤەكەن. **(بوٚژر جمهور)**
- ڤەنجييێن بچيك ژ بير نەكەن، هەروەسا تـاوانێن بچيك نەئيننـە بـيرا خـوٚ. **(پەندەكا چينييە)**
- هـەر كەسـێ د ژيـانێ دا نـانێ وى نەهێتـە خـارن، چـاخێ مرنـێ نـاڤێ وى ناهێتە ئينان. **(سەعدى شيرازى)**
- هەر كەسێ لێبوٚرين زوٚرتر هەبيت ئەو زەنگين ترە. **(جوٚرجسيوٚن)**
- چێدبيت ماچەك جهێ گونەهەكێ پاقژ بكەت. **(بالزاك)**
- هەر كەسێ پتر شيان و دەست هەلات هەبيت زێدەتر يێ ژ هەژى لێبوٚرينێ يە. **(عەلى كورێ ئەبو تاڵب) خودێ ژێ ڕازى بيت**
- پێدڤى ئەم چێتر ژ كرنـا خراپيـێ بترسـين نـەك ژ ديتنـا خراپيـێ. **(ئـەبو عەلا)**
- ئەو كەسێ ل كەسێن بن دەست هەلاتا خـوٚ نـەبوٚريت دێ دووچـارێ گـورزا كەسێن ژ خوٚ دەست هەلات دار تر بيت. **(سەعدى شيرازى)**
- بەخشين و بوٚرين هنگييە هێشتا يێ ژ مروٚڤى نەهاتيە خاستن. **(حەسەنێ كورێ عەلى) خودێ ژێ ڕازى بيت**

# بەختەوەری و بەدبەختی

- مرۆڤێ عاقل بۆ هەر پێشهاتەکا نەخۆش یێ بەرهەڤە. **(محمد حیجازی)**
- مـرۆڤ بەختـەوەر نابیـت ئەگـەر بـۆ بەختـەوەریا یـێن دی تێنـە کۆشـیت. **(رۆسن پیر)**
- مرۆڤ خۆ نانیاسیت ل چاخێ هەژاری و بەدبـەختیێ دا نـەبیت. **(ئـالفۆرد دۆمۆسی)**
- بەدبەختی پێکهینەرێ شیانایە. **(هۆگۆ)**
- ڤەومین بەرهەمی وان تۆڤایە یێن ئەم دچینین. **(؟)**
- هیچ بەدبەختییەك ژ نەڕازی بوونێ مەزنتر نییە. **(لافۆتێ)**
- مەزنترین بەختەوەری ئارامیا هزرییە. **(بۆدا)**
- هەتا ئەم بەدبەختیێ نەنیاسین چ جارا ئەم فێری رێکا ب دەست ڤە ئینانا بەختەوەریێ نابین. **(داویدوایت)**
- بەدبـەختی ل دەرگەهـەکی را دچیتە د ژۆرڤـە کو ژێـرا هاتبیتـە ڤـەکرن. **(پەندەکا چیکۆسلۆڤاکییە)**
- بەختەوەری نیشانێ ساخلەمیا جانییە. **(ویلیام جیمز)**
- بەختـەوەرترین بوونـەوەر ئـەو کەسـە کـو بەختـەوەریا خـۆ دمـالا خـۆدا ڤەبینیت. **(گوتە)**
- بەختەوەرترین کەس ئەوە ژ هەمیا پـتر پێکۆلێ بـۆ بەختـەوەریا کەسـێن دی بکەت. **(لاڤشفۆگۆ)**
- بەختەوەر ئەو کەسە کو ببیتە سەر بۆرێ شانازیە مللەتێ خۆ. **(؟)**

- خۆشیێن کچکە بەختەوەریێن مەزن چێدکەن. **(ئالفونسکار)**
- بەختەوەر ئەو کەسە یێ قەردار نەبیت. **(؟)**
- ئەو دیوارێ دناڤبەرا مەو بەختەوەریێ دا دهێتە دانان ئەم چێدکەین. **(؟)**
- دویر کەفتنەڤە ژ خەلکێ شەڕخاز دەریاچەیا بەختەوەری و بەخت باشیێ یە. **(بتهوون)**
- هەر بەدبەختییەکێ خالەکا باش یا هەی. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- سێ رێکێن بەختەوەریێ هەنە خراپی نەدیتن، خراپی گوهلێنەبوون و خراپی نەکرن. **(پەندەکا چینییە)**
- ژ بیرکرن قەپاغا هەمی غەمایە. **(نیزام وەفا)**
- ئەگەر مرۆڤ ب کێمەکێ بەختەوەر نەبیت ب هەمی تشتا بەختەوەر نابیت. **(ئپیکۆر)**
- کلیلا بەختەوەریێ یا د ئختیارا گۆتارو کریارێن مەدا. **(پەندەکا چینییە)**
- ئەو کەسێ ل دەرڤەی مالا خۆ ل دیف بەختەوەریێ بگەڕیێت هەروەکی سەردوی سبەرێ ب ئینیت. **(پەندەکا چینییە)**
- ئەو کەسێ چاڤەڕێی ئێمناهیێ بیت دڤێت یێ کەڕو کورەولال بیتن. **(پەندەکا تۆرکییە)**
- مرن گرنگ نییە، بەختەوەر بوون گرنگە. **(ڤیکتۆر هۆگۆ)**
- ب هزاران رێکێن هەین بۆ بەختەوەر بوونێ ئەگەر رێکەك ل هەوە هاتە گرتن رێکەکادی هەلبژێرن. **(یۆرسن)**
- هیچ کەسەك ژوی کەسی بەدبەختتر نییە یێ ژ رۆژگارا خۆ ڤەمابیت. **(سەعید نەفیسی)**
- لەزتێن مە سەرڤەیی نە، دەردێن مە دکویرن. **(پەندەکا چینییە)**
- بەختەوەر ئەو کەسە کو مامۆستایێ وی رۆژگار بیتن. **(سەعید نەفیسی)**

- دەمێ مرۆڤ ئاراميا خۆ دهناڤێن خۆدا ڤەنە بينت ژ ڤەستا ل جهێن دی لێدگەڕيێت. **(لارشفۆگۆ)**
- هەر بەدبەختيەكا دووچارێ من ببيت ژ بەر متمانەو باوەرا منە ب دۆستێن من. **(جان جاك رۆسۆ)**
- بەدبەختيەكا خراپ بەدبەختيەكا دی ل پشتا خۆ بار دكەت. **(پەندەكا دانيماركييە)**
- نيڤرۆژەكا بەختەوەريێ باشترە ژ سالەكا بەدبەختيێ. **(پەندەكا ئەفريقييە)**
- خۆشبەخت ئەو كەسە نە ب مرنا كەس كەيف خۆش ببيت، نە كەس ب مرنا وی كەيف خۆش ببيت. **(سەعيد نەفيسی)**
- بەدبەختی و خۆشبەختيا مرۆڤا يا گرێدای نييە ب سامانێ وانڤە بەلكی يا گرێدايە ب خۆورەوشتێ وانڤە. **(لارۆسفۆگۆ)**
- نازو نيعمەتێن خۆ بژمێرن، نەك بێ پاری و كێماسيێت خۆ. **(ديل كارەنگی)**

# باوەری ب خۆ هەبوون

- ئەگەر ئەز دەستێ خۆ ببەمە دناڤ دەڤێ ئەژدەهایەکی دا مـن پێخۆشـترە ژ هندێ دەستێ خۆ ل بـەر نامـەردەکێ دەسـت هـەلات دار درێـژ بکەمەڤـە و تشتەکی ژێ بخازم. **(عەلی کوڕێ ئەبی تالّب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەگەر تە باوەری ب ئێکی نەبیت ژێ دویر بکەڤە. **(ناپلیۆن)**
- مرن ژ برسادا باشترە ل نانێ نەمەردا. **(سەعدی شیرازی)**
- نانێ خۆ ب خۆ ب ئاڤێ منەتا خەلکی پاڤێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- ل دونیایێ ب تنێ کەسەك دێ سەرکەڤیت کو ل هیڤیا یێن دی نەڕوینیتـە خارێ و هەمی تشتەکی ژ خۆ بخازیت. **(شیللەر)**
- بەر ل جهێ خۆیێ ب سەنگە. **(پەندەکا کوردییە)**
- مەزناتیا بڕاستی ئەوە ب سەر نەفسا خۆدا زالّ ببی. **(دانیل دیفو)**
- ئەو کەسێ نەشێتە خۆ نەشێتە هیچ کەسەکی. **(زەردەشت)**
- ل هیڤیا وریسێ خەلکی ڤەت نەچە شاخ و چەلکی. **(پەندەکا کوردییە)**
- مەرد ئەو کەسـە پـارێ خـۆ ببەخشـیت و نامویسا خـۆ بپارێزیـت. **(عـەلی کوڕێ ئەبو تالّب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئـەو کەسـێ بـاوەری ب خـۆ هـەبیت پێـدڤی نییـە کـەس پـێ هەلبێـژیت. **(گۆستاو لۆبۆن)**
- شەرەف وەکی تـیرێ یـە ئەگـەر ژ کڤـانی دەرچـوو چ جـارا ڤەنازڤرِیتەڤـە. **(عەلی کوڕێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**

- مینا وی چیچکی به کو ل سەر تایەکێ زراڤێ دارێ دنیشتیت و دخوینیت و هەست پێ دکەت تایێ دلەرزیت، لێ ل سەر خاندنا خۆ یێ بەردەوامبیت، چونکی یێ پشت راستە ئەگەر تایێ دارێ بشکێت ژی وی پەڕو بالێن هەین. **(هۆگۆ)**
- یێ هێژاو بهاگران بە دا ل دەڤ هەمی کەسا یێ خۆستڤی بی. **(بێهرۆز)**
- هەر کەسێ بۆ میرێ نەفسا خۆ دێ بیتە میرێ نەفسا کەسێن دیژی. **(؟)**
- چاخێ باوەری ب خۆنە بوونێ دەست پێکر دلسۆزی ژی نامینیت. **(پۆشگین)**

# بڕیار و ئیراده

- رۆژا تۆ بوویه سندان یێ خۆڕاگر به، رۆژا تۆ بوویه چەکوچ موکم و قـایم راوەشینه. **(ئیسمایلز)**
- ئەو کەسێن نەشێن خۆ برێڤـه ببـەن، نەچارن گـوهێ خـۆ بدەنـه کەسـێن دی. **(ڤیکتۆرهۆگۆ)**
- کەس ب خۆزیا ناگەهیته قەبدێن کەزییا. **(پەندەکا کوردیه)**
- ئـیراده کـا ب هێـز حـوکمی ل هـەمی هێـزا دکـەت لـێ ب مەرجـەکی دگـەڵ عەقلی یا هەماهەنگ و گونجاوو بیت. **(لۆفۆن)**
- ئیراده دارەکا مەزنه شارسـتانیەت و پێشـکەفتن و کـەمال تـایێن ب هێـزێن وێنه. **(نیزام وەفا کاشانی)**
- ئیراده و باوەر موکمی دێ مەگەهینته مرادێ، نه حەزو ئارەزوو. **(؟)**
- خەسـڵەتێ بڕیـارو ئـیرادێ ژ هـەمی خەسـڵەتەکێ دی بمفـاتره بـۆ لـەش و جانی. **(پۆشه)**
- هەبوونا شیانێن مەزن بێی ئیرادەکا مەزن چ رامان (معنی) نییه. **(باڵزاك)**
- کەڤتنـه دنـاڤ چـالێ دا شـەرم نییـه، لـێ دەرنەکـەڤتن ژ چـالێ شـەرمه. **(پەندەکا ئەڵمانی یه)**
- ئەگـەر دلێ بخازیـت هـزار رێکـێن هـەی، لـێ ئەگـەر دلێ نـەخازیت هـزار هەجەتا دێ ڤەبینیت. **(پەندەکا برۆنیه)**
- خراپترین خەم و کۆڤان گۆمان و دۆدلییه. **(ئەلیکسەندەر دۆما)**
- مـەزنترین جـوداهی دناڤبـەرا مرۆڤـاو ئـاژەلان دا هـزرو تێگەهشـتن نییـه، بەلکی ئیراده و ئەختیاره. **(رۆسۆ)**

- ئەگەر ئازادیا ئیرادێ ژ مرۆڤی بهێتە ستاندن، هەمی کریارو بهایێن ئەخلاقییێن خۆ دێ بەزرکەتن. **(رۆسۆ)**

- ب هەبوونا ئیرادەکا موکم دێ ببیە خودانێ هەمی تشتەکی. **(گۆتە)**

- باشترین دەم بۆ پێگەهاندنا ئیرادێ رۆژێن گەنجاتیێ نە. **(لاک)**

- خەمساری لاوازییە. **(کوکرل)**

- سەرکەفتن ئانکو ئیرادەکرن. **(ناپلیۆن)**

- خاستن شیانە، بخازە دابشێی. **(کازم زادە)**

- تەڤایا حەزو خاسێتن خۆ دناڤبەرا دۆ دیوارێن موکمێن ئیرادێ و عەقلی دا زیندانی بکە. **(ئەرستۆ)**

- چاخێ تورەبوونێ ئەز بریارێ نادەم. **(چەرچل)**

- زانین بێ خاستن چ جارا شیانێ چێناکەت. **(گۆستاو لۆبۆن)**

- دژوارترین پێنگاڤ پێنگاڤا ئێکێ یە. **(پەندەکا بەلجیکییە)**

- قویناغا هزار میلا ژ گاڤائێکێ دەست پێدبیت. **(پەندەکا چینییە)**

- ئەو کەسێ ئیرادەکا ئازاد نەبیت، بەرپرسیاریەتیەکا ئەخلاقی نییە. **(ئەرستۆ)**

- ب هێزترین کار ئیرادەیە. **(ئیسمایلز)**

- زمانێ مەحالیێ (مستحیل) دڤێت دناڤ فەرهەنگا دا بهێتە رەشکرنەڤە. **(ناپلیۆن)**

- نیشانێ هەمی سەرکەفتنا ئیرادەیە. **(؟)**

- سەنەد پارچە دبیت لێ سۆز پارچە نابیت. **(گۆتە)**

- ئەو کەسێ خودان باوەرو ئیرادە بیت دێ کاریت جیهانێ ل دیڤ حەزو مەیلا خۆ بگۆریت. **(گۆتە)**

- باوەرو ئیرادە کانیەکە چ جارا بۆ خازیارێن وێ هشك نابیت. **(ج. پ)**

- ل چاخێ بڕیاردانێ هەوارا خۆ بۆ کەسێن دی برن کارەکێ نەعاقلانەو بێ مفایە. **(ئیسمایلز)**
- بۆ کەسەکی کویێ خودان ئیرادە بیت هیچ تشتەك نییە یێ مەحال بیت. **(میرابۆ)**
- ئەگەر وە بڕیارا کارکرنێ دا دڤێت هەمی دەرگەهێن گۆمان و دۆدلیێ قەپات بکەن. **(نیچە)**
- سیار ئەو سیارە یێ بکەڤیت و راببیتەڤە. **(پەندەکا کوردییە)**

# تورەبوون

- ئاغایێ تورە بوونا خۆبە. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- ئەگەر ژ بەر نەشیانێ تورە ببی بەلگەیە ل سەر هندێ کو تۆنەیێ ب هێزی. **(ڤیلتەر)**
- خۆ ژ تورەبوونێ بپارێزە، چونکی تورەبوون دێ مرۆڤی بەرەڤ پەستیا داخازا لێبۆرینێ نەچار کەتن. **(صادق)**
- بێن فرەهی چاخێ تورەبوونێ و گەشی چاخێ تەنگاڤیێ ئاریشەترین کارن. **(؟)**
- مەزنترین دەرمانێ تورەبوونێ هەدارو بێن فرەهییە. **(سنگا)**
- سزادان چاخێ تورەبوونێ چاکسازی نییە، بەلکی تۆلە ڤەکرنە. **(موونت نین)**
- تشتەك کو نەهێتە پڕ کردنەڤە تورەبوونە. **(ئستاهل)**
- تورەبوونا د جهێ خۆدا یا هەژی مرۆڤێ ژێزانە. **(ڤیلۆن)**
- تورەبوون ب شێتاتی دەست پێدبیت و ب پشێمان بوونەڤێ ب دیماهیك دهێت. **(فیساغورس)**
- تورە بوون تۆلا هەلەو شاشیێن دی ژ خۆڤە دکەت. **(ڤالتەرپۆپ)**
- تورەبوون کەربەکا دیارو دەمکی یە، لێ عیناد تورەبوونەکا بەردەوام وهەلگرتییە. **(لارابرویر)**
- دناڤ دلێ هەرکەسەکی دا شیرەکێ ڤەشارتی هەیە. **(پەندەکا ئەرمەنی یە)**
- چێتبیتەڤە جهێ خەنجەرا لێ چێنابیتەڤە جهێ خەبەرا. **(پەندەکا کوردییە)**

- جڤين برينەكە ناهێتە دەرمان كرن. **(پەندەكا عەرەبييە)**

- چاخ دەرمانێ تورەبوونێ يە. **(پەندەكا ئەلمانى يە)**

- ب ڤەساخۆش مار ژ كونێ د هێتەدەرێ. **(پەندەكا كوردى يە)**

- گۆتنێن نەرم وئارام تورەبوونێ د ئينتە خارێ. **(پەندەكا يوگسلافييە)**

- سە ژى ژ مرۆڤێ دفن بلند دڕەڤيت. **(پەندەكا فەرەنسى يە)**

- سێ تەخێن خەلكى هەنە دڤێت نەهێنە تورەكرن كار بدەستێن حكومەتێ، كڕيار ،بێوەژن. **(پەندەكا چينى يە)**

- تورە بوون كليلا هەمى شەڕەكى يە. **(سادق)**

- ئەوكەسێ لبەر بيت بەس گورزەكێ ڕاوە شينيت چێدبيت ئێكى بكوژيت. **(پەندەكا فەرەنسى يە)**

- تڕانە دبنە مژانە. **(پەندەكا كوردى يە)**

- هەرتشتەكى تۆڤێ خۆ يێ هەى، تۆڤێ دوژمنكاريێ ژى تڕانەنە. **(؟)**

- گاڤا تورە بوون دئاخڤيت، عقل روويمەتێ خۆ دادپۆشيت. **(پەندەكا چينى يە)**

- مرۆڤێ تورە هەمى گاڤا يێ پڕى ژەهرە. **(كنفووسيوس)**

- ئەوكەسێ دەست هەلات ب سەردەمارێن خۆدا نەبێت يێ هەژى هندێ نييە پيێ خۆدانيتە سەر كچكەترين پێپەلانكا پێريسكا سياسەتێ. **(گۆسناولوبۆن)**

- زەلام ئەو نييە كو هێرشێ بينيت ،بەلكێ ئەو كەس زەلامە يێ ل دەمێ تورەبوونێ دا يێ خۆراگربيت و ژتوخييێ وژدانا خۆ زێدە گاڤێ نەكەت. **(سەعدى .ش)**

- ب كليلا تورە بوونێ چ دەرگەهـ، ناهێنە ڤەكرن. **(ج. پ)**

# تەماعی و حەسویدی

- هندقاس رژد نەبن ل سەر خرڤەکرنا سامانی ،داکو چاخێ ژدەست ددەن غەمگین وعاجز نەبن. **(سوقرات)**
- کەسێن خازخازۆك چ جارا ئازاد نینە. **(قبار شهریار)**
- خـۆلام بـەس خزمـەتکارێ ئاغـایێ خۆیـە ، لـێ مرۆڤـێ تـەماع خـۆلام وخزمتکارێ وا هەمی کەسایە ئەوێن هاریکاریاوی دکەن. **(ئەمرسۆن)**
- مرۆڤێ خازخازوك تێر نابیت هەتا تـەژی چاڤێن وی ئـاخ نـەبیت. **(لۆرد ئاڤیبۆری)**
- چاڤبرسـی یـێ محتاجـە بـلا هـەمی دونیـا یـا وی بیـت. **(علـی کـوڕێ ئەبوتالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- زەنگینی یا ب مالێ نییە یا ب قەناعەتێ یە. **(پەندەکا کوردی یە)**
- دۆستێ نەفسێ یێ زیزە. **(پەندەکا کوردی یە)**
- چ تشتەك وەکی چاڤبر سیەتییا مرۆڤی یا بێ دیما هیك نییە. **(؟)**
- سەربلندی وسەروەری و هەژیاتی یا دقەناعەتێ دا وە هەژاری و پەستی و سەرشۆڕی یاد چاڤبر سیە تیێ دا. **(؟)**
- ئەگـەر حەسـادەتێ خەسـلەتێ سـۆ تـنێ هـەبا پێـدڤی ب چ ئـاگرێن دی نەدبوو. **(پەندەکا یۆ گسلاڤ یە)**
- ئەگەر ئێکی حەسویدی ب تەدابر بەلگەیە ل سەر باشتر بوونا تە. **(تەن)**
- مرۆڤ نکاریت ژ دۆستێ حەسوید یێ ئەمین بیتن. **(بۆزەرجمهور)**

- حەســـوید بـــەری کەســـێن قەلـــەو ب چـــاڤا ببـــەت دێ ب لاوازی مریـــت. **(ئەمیرڤلی ئەمین)**

- حەسوید نەیێ دلخۆشە نەیێ بەختەوەرە. **(پۆشە)**

- حەسوید تیرێ دهاڤێتە یێت دی و خۆبریندارد کەت. **(پەندەکا سویدی یە)**

- حەسوید وەسا هزر دکەت ئەگەر پییێ هەڤسوییێ (جیران) خۆ بشکێنیت دێ خۆ شتر ب رێڤەچیت. **(پەندەکا دانیمارکی یە)**

- حەسویدێ کورەیە. **(پەندەکا دانیمارکی یە)**

- مرۆڤێ حەسوید نابێتە زەلام. **(پەندەکا عەرەبی یە)**

- حەسویدی وەکی مێشە رەشێ یە کی جهێ لەشی یێ بریندارە دێ ل سەر وێرێ نیشتیت. **(چاپمن)**

- هەمی دوژمن دێ بنەڤ دۆست بەس حەسوید نابنەڤ دۆست. **(علی کورێ ئەبوتالب) خودێ ژێ رازی بیت**

# تێکەهەلی و هەڤالینی

- هەڤالێن شەڕانی هەلنە بژێرە ، چونکی ئەگەر ئیهانە تا تەژی نەکەن دێ منەتا ل سەرسەرێ تەکەن. **(ئەفلاتون)**
- هەرکەسێ ژتە یێ بێزاربیت و نەفرینا ل تەبکەت خۆژێ دویر بێخە بلائەو مێش بیت وتۆفیل. **(پەندەکا ئەفریقی یە)**
- ئەگەر تۆ چوویە ناڤ ڕەڤێن گورگا دێ فێرە لویرەلویرا وان بی. **(پەندەکا فەرەنسی یە)**
- تێکهەلیا مرۆڤێ باش بکە دا تۆژی ببیە ئێك ژوان. **(جورجهربرت)**
- خۆ بپارێزە ژنەزانەکی کوخۆ زانا بزانیت. **(؟)**
- مرۆڤ دکاریت بێنا خۆ ل سەر چایا ساروبرنجا سار فرەبکەت، لێ مرۆڤ نکاریت ل سەر روویمەتەکێ سارو گۆتنەکا سار خۆبێن فرە بکەت. **(پەندەکا چینی یە)**
- رەفتار و ڕەوشت خۆدیکەکە هەرکەسەك خۆ تێرادبینتەڤە. **(گۆتە)**
- مرۆڤێ قەردار بیت نەوەکو ژنەکا خراپ هەبیت. **(پەندەکا سویدییە)**
- خەسلەتێن هەر کەسەکی سەر ب باش و خراپێن دۆستێن وی نە. **(پەندەکا ژاپۆنییە)**
- مرۆڤێ بەرکەفتی ب باش رەفتارکرنێ دەردکەڤیت نە ب زێدە هۆشیێ. **(میچەر)**
- دۆستایەتیکرنا مرۆڤێ عاقل خەزینەیەو تێکهەلیکرنا مرۆڤێ نەزان دەردو نەخۆشییە. **(سوقرات)**

- دۆستایەتی کرن دگەل مرۆڤێ راست ژ هەر سامان و عەردەکێ پڕ خێرو بەرەکەت چێترە. **(ئەندرسپیدیس)**

- تێکهەلی کرن دگەل مرۆڤێن رەوشت بەرزو هەژی باشترین ژێدەرێ موکمکرنا وورەیا جحێلانە. (؟)

- حەژ هەڤسوییێ (جیران) خۆ بکە، بەلێ دیوارێ دناڤبەرا خۆو ویدا رانەکە. **(پەندەکا ئەلمانییە)**

- دۆستێ خراپ ئەگەر تە نەسوژیت ژی دێ تە رەشکەتن. (؟)

- تشتەکێ دیارو خۆیایە رەفتارەکا حەکیمانەو ژێزانانە یان سەرە دەریکرنە کا (تعامل) نەزانانە مینا نەساخییێ ژ نەخۆشەکی بۆ نەخۆشەکێ دی دهێتە ڤەگواهاستن، ڤێجا فەرە خەلك ب هۆشیاری وان کەسان هەلبژێرن ئەوێن وان دڤێت تێکهەلی و سەرەدەرییێ دگەل دا بکەن. **(شکسبیر)**

# جوانی

- ئەو نیعمەت پارا مەیە کو قەدرێ وێ بزانین ، ما دیمەنێ کەشخە چ بۆ کورەی هەیە؟ **(تف)**
- مرۆڤێ باش ئەگەر یێ خودان چاکی بیت.چاکیێن وی پتر ژ جوانیێین وی دهێنە بەر چاڤا. **(دیرژیل)**
- براستی جوانی ئەوە کو مرۆڤی باشتر لێبکەت. **(خاتۆ ئستاهل)**
- ل جحێلییێ دا هەمی تشتەکێ جوانە. **(پەندەکا ئەفریقی یە)**
- جوانیا بێ پاکی و باشی مینا گولەکا کەشخەیە، بەلێ یابێ بێنە. **(سوقرات)**
- جوانی بچیتە بەر هەر دەرگەهەکی مێڤانە کا خۆشتڤی یەو دێ پێشوازی لێ هێتە کرن. **(گۆتە)**
- دڤێت مرۆڤ ل دەرڤەو ناڤدا یێ جوان وکە شخەبیت. **(چخۆف)**
- جوانی یا دچاڤێ بینەری دا. **(پەندەکا ئنگلیزی یە)**
- جوانی هەروهەر نامینیت ،لێ باشی هەروهەر دێ مینیت. **(گۆتە)**
- جوانیا بێ ڤەنجی وەکی پیشلۆکا بێ کاکلە. **(ج.پ)**

# خیانەت (ناپاکی)

- ئەویّ خیانەتەکا بچیك بکەت دێ خیانەت کا مەزن ژیکەت. **(؟)**
- بێزار یا خۆ ژگونەهێ بکەن نە ژ گونە هکاری. **(گاندی)**
- ژشەڕێ وی کەس ئەمین نەبن یێ ڕێزێ بۆ خۆنەدا نیت. **(ا.هادی)**
- ئەگەر دیتم ئەزم ئەگەر نەدیتم دزم. **(پەندەکا کوردی یە)**
- ئەگەر تەخوێ خار خوێدانکێ نەشکێنە. **(پەندەکا فارسی یە)**
- ئەگەر تە ل کانیەکێ ئاڤاسار ڤەخار بەرا نە هاڤێژێ. **(پەندەکاکوردی یە)**
- زمان لویس وحلوی چ جارا خودانێن نیازە کا پاقژ نینە. **(ڤۆلتەر)**
- مرۆڤێ خائین هەرگاڤ یێ ترسنۆکە. **(پەندەکا عەرەبی یە)**
- پڕانیا ئەو کەسێن حیلاو خیانەتێ دەکەن کەسێن لاوازن. **(لارشفۆرگۆ)**
- هەرکەسێ خیانەتێ بکەت دێ ل دەمێ حساب ولێپرسینە ڤێ دەستێن وی لەرزن. **(؟)**
- ئەویّ حسابا وی یاپاقژبیت ژ لێپرسینە ڤێ ناترسیت. **(پەندەکا کوردی یە)**
- ئەویّ جارەکی دزیێ بکەت، دێ هەمی جارا دزیێ کەتن. **(پەندەکا ئەسپانییە)**

# خۆشكاندن

- ئەویٰ پەرپێڤە نەبن نابیت ل جهێن عاسیٰ هێلینیٰ چێکەت. **(نیچە)**
- ئاگرب ئاگری ناتەمریت. **(پەندەكا یونانی یە)**
- مرۆڤ مینا رۆیباری یە هەرچقاس کویرتربیتن ئارامترە. **(منتسكیو)**
- بێن فرەهی باشترین ئەگەرە بۆ نەهێلانا هەر رەنگە نەتەناهیەکیٰ. **(پلۆتوس)**
- مرۆڤ بوونەوەرەکە گەرەکە بسەر خۆدا زال ببیت. **(نیچە)**
- وەسا دگەل کالان رەفتاریٰ بکە هەروەکی دگەل بابیٰ خۆ رەفتاریٰ دکەی. **(پەندەكا ژاپۆنییە)**
- ل جهیٰ خۆ دانیشە کەس تە رانا کەت. **(پەندەكا ئەمریكییە)**
- هەتا نەگەهییە پریٰ ڤەنەپەرە، هەروەسا بۆ شیریٰ رژیایی نەکە بەهی. **(دیل كارەنگی)**
- هەدارو بێن فرەهی مەزنترین مێرخاسییە. **(پاستۆر)**
- دفن بلندی ب هزاران خەسلەتێن باش ڤەدشێریت. **(كنفۆسیۆس)**
- دگەل هەمیا ییٰ خۆشکاندی بە، هەروەسا هیچ خۆشکاندیەکی سڤك نەکە. **(ئەخلاقیٰ ناصری)**
- تفا دەڤیٰ خۆ نەهاڤێژە وی لاییٰ با ژیٰ دهێت. **(نیچە)**
- کارو کریارێن مرۆڤی مینا خودێکیٰ نە روویمەتیٰ مرۆڤی تێدا دەردکەڤیت **(گوتە)**

- گرانترین ووشی ئەوە کو پتر بۆ رەخێ عەردی شۆڕببیتەڤە. **(پەندەکا ئیرلەندییە)**

- ئەگەر تۆ سیاری هەسپی بووی ئەوێن پەیا ژبیر نەکە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- مەزناتیا مرۆڤێ مەزن دەمێ رەفتارکرنێ دگەل خەلکێ بەلەنگاز دەردکەڤیت. **(دیل کارەنگی)**

- مرۆڤ هەر چقاس دفن بلندتر بیت هند قاس ئەو نهالا دکەڤیتە تێدا کویر ترە. **(؟)**

- هەمی کەسێن دەست هەلات خاز ئەسیرن، هەروەسا هەمی کەسێن زۆر خاز گەدانە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- چ جارا نەڕوینە جهێ کەسەکی کو بشێت بێژیتەتە ڕابە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- خودانێ سەبرێ بۆ میرێ مسرێ. **(پەندەکا کوردییە)**

- ژنا ئەنیشتاین رەخنە ل جل و بەرگێن بێ سەروبەرێن وی گرتن ، د بەرسڤێ دا ئەنیشتاین گۆتێ جهێ داخێیە کو تە دڤێت کە ڤلوژانك ژ کاکلکێ باشتر بیت، ئانکو جلکێن من ژ من باشتر بن. **(ئەنیشتاین)**

- مرۆڤ وازێ ل داخازا خۆ بینیت باشترە ژ وێ چەندێ کو خۆ بەرمنەتی کەسەکێ پەست و نەژهەژی بکەتن. **(؟)**

- مرۆڤێ مەزن دگەل خۆ یێ تۆندە، لێ مرۆڤێ کچکە دگەل خەلکی یێ تۆندە. **(کنفۆسیۆس)**

- هوین دزانن ژێزانی و حیکمەتا مرۆڤێ حەکیم کەنگی دەردکەڤیت؟ هنگی دەردکەڤیت چاخێ خۆ کچکەو کێم نیشان ددەت. **(سوقرات)**

تۆ مرۆڤەکێ مەزنی، خودان هێزی، کارەکی بکە کو قەدرێ تە بزانم و رێزێ ل تە بگرم. **(لابرویەیر)**

# خۆڕاگری و بێن فرەهی

- ئـــەو كەســێ خـــودان ئیرادەبیـــت ویـــێ خۆراگربیـــت چ جـــارا ناشـــكێت. **(مترلینگ)**
- مرۆڤێ بێن تەنگ و ب لڤەلڤ دوژمنێ خۆیە. **(پەندەكا ئیتالییە)**
- گرنگ نییە سامانێ خۆ ژ دەست بدەی، گـرنگ ئـەوە هـەدارا خـۆ ژ دەسـت نەدەی. **(؟)**
- خۆڕاگری دایكا سەركەفتنێ یە، سەركەفتن ژی دایكا بەختەوەرییێیە. **(كازم زادە)**
- ئەگەر چیا ژی بلـەرزن، تـۆ ل جهـێ خـۆ یـێ مـوكم و خۆڕاگربـە. **(عـەلی كوڕێ ئەبی تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- هوین چاڤەڕێی هندێ نـەبن كـو هـەمی تشـتەك ل دیـڤ دلـێ هـەوە بیـت، بەلكی هەر تشتەكێ چاوایە وەسا پێ رازی ببن دا ژیانـا هـەوە ب ئێمنـاهی دەرباز ببیت. **(ئپیكتاس)**
- بلا شـانازی و دەسـتكەفت دگـەل خۆشـكاندنێ، وە هـەژاری دگـەل هـەدارێ (صبر) ب هەڤڕابن. **(پەندەكا ئەمریكییە)**
- باشـترین چارەسـەرا تورەبـوونێ ئـەوە بهێتـە پـاش ئێخێسـتن و ڤـەهێلان **(سلیكا)**
- بێن فرەهی دەرگەهێ ئێمناهیێ ڤەدكەت. **(پەندەكا رۆژهەلاتییە)**
- دویر هەڕە دروست وەرە. **(پەندەكا كوردییە)**
- ب بێن فرەهی گیا دبیتە شیر. **(پەندەكا چینییە)**

- بێن تەنگی بەربەستەکا مەزنە درێکا سەرکەفتنێ دا. **(ناپلیۆن)**
- بێن فرەهی کلیلا شادیێ یەو لەزکرن کلیلا خەمایە. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- دامان پاکی و خۆڕاگری ژ هەمی سۆزو پەیمانا موکمترن. **(مادام نکر)**
- مەزنترین مێرخاسی هەدارو بێن فرەهییە. **(پاستۆر)**
- رازی بوون ب قەومینێن بێ چارەسەر گرنگترین زادێ وەغەرا (سفر) ژیانێیە. **(شۆپنهاوەر)**
- خۆشکاندن خەسلەتەکێ دیارێ وان کەسایە ئەوێن گەهشتیە پلێن بلند. **(؟)**
- بلا بهێنا هەوە یا فرە بیت دا ب سەر هەمیادا سەر بکەڤن. **(سن دوست)**
- ئەو دەستێ بلەرزیت نەشێت گرێ ڤەکەت، هەروەسا د ناڤ دل و دەروونێت شەپرزەدا ژی هزرا دروست پەیدا نابیت. **(حیجازی)**
- نەپەنییا سەرکەفتنێ دناڤ خۆڕاگریێ دا یا نخافتییە. **(دیسرائیلی)**
- هەر رۆژا دارا بێن فرەهیێ دناڤ باغێ تەدا بهێتە چاندن ل هیڤیا فێقیێ سەرکەفتنا وێ بە. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- رۆژەك دێ هێت هەمی دەرگەه ل سەر کەسێن بێن فرەه بهێنە ڤەکرن. **(پەندەکا چینییە)**
- چاوا سنگێ تە بۆ هەلەو شاشیێن تە یێ فرەیە بلا وەسا بۆ کەسێن دیژی یێ فرە بیت. **(فنلۆن)**
- رۆژگار مامۆستایەکێ مەزنەو دێ گەلەك ئاریشا چارەسەر کەتن. **(کورنی)**
- ئومێدو هەدار دۆ ئەگەرێن سەرکەفتنێ نە. **(ئەلیکسەندەر دۆما)**
- ئەو سەرکەفتنێن بووینە بەهرا مرۆڤایەتیێ پڕانیا وان دبن سەبەرا هەدارو بێن فرەهیێ دا بووینە. **(شکسپیر)**
- ب هێزترین کەس ئەوە یێ تورەبوونا خۆ دا دعویریت. **(ئەفلاتون)**

- وەكـی گـای یـێ بـێن فرەبـە، وەكـی شـێری یـێ زیـرەك بـە، وەكـی مێشـا هنگڤینی یـێ زەحمـەت كێشبە، وەكی چیچـكی یـێ دلشـادو چـەلەنگ بـە. **(پەندەكا تەبەرستانییە)**

- ئەگەر حەفت جارا ژی كەفتی بۆ جارا هەشتێ رابەڤە. **(پەندەكا ژاپۆنییە)**

- دەمێ كەسێن دی هەدارا خۆ ژ دەست ددەن تۆ یێ بێن فرەه بە. **(؟)**

- چ تشـتەك هنـدی بـێن فرەهیـێ یـێ تـەژی سـەركەفتن نییـە. **(پەنـدەكا چینییە)**

- چ جارا هـەدارو بـێن فرەهیـێ ژ دەسـت نـەدەی، چـونكی ئەڤـە دیمـا كلیلـە دەرگەهی ڤەد كەت. **(تاكو پیری)**

- ئەو كەسێ هێدی هێدی بچیت دێ زۆر چیت. **(پەندەكا چینییە)**

- هەر كەسێ بكاریت بێنا خۆ فرە بكەت رۆژگار دێ هەمی دەرگەهەكی ژێرا ڤەكەت. **(پەندەكا چینییە)**

- ب بێن فرەهیێ دێ كارن بگەهنە هەمی مرازەكێ. **(لافۆنتن)**

- ئەگەر مە دەست هەلات ب سەر خۆدا هەبیت دێ چارەنڤیسێ مە ددەسـتێ مەدا بیتن. **(كلینگەر)**

- ئەو كەسێ ژ رۆژگارێ تورە ببیت هەر تشـتێ فێـر ببیـت ژ ڤەسـتا بوویـە. **(؟)**

- هەمی گاڤا بێن فرەهی دشێتە تورە بوونێ. **(پەندەكا ئەفریقییە)**

- مە كراسێ هەدارێ كرە بەرخۆ، ژ بـەر كـو چ تشـتەك وەكـی بـێن فرەهیـێ چارەسەریا نەخۆشیا ناكەتن. **(بۆزجمهور)**

- چڤاس مێش ب هەسپێ زیرەك ڤەدەن نكارن. ژ غاردانێ بێخن. **(ڤۆلتەر)**

# پەرتووك - ڤەخویندن

- ژۆرا بێ پەرتووك مینا كەلەخێ بێ جانە **(سیسرون)**
- دڤێت زۆر ڤەخوینین دابزانین كو ئەم چ نزانین. **(مونتسكیو)**
- پێدڤییە دەرگەهێن زانینێ بۆ هەمیا بهێنە ڤەكرن، ل كیرێ باغ هەبیت ل كیرێ مرۆڤ لێبژیت دڤێت پەرتووك ژی هەبیت. **(ڤیكتۆر هۆگۆ)**
- ل جیاتی چەندین پەرتووكان ڤەخوینی، پەرتووكێن باش و هەژی چەندین جارا  ڤەخوینە. **(؟)**
- پەرتووكا باش دلسۆزترین دۆستێ مرۆڤە. **(؟)**
- خراپترین دز پەرتووكا خراپە. **(پەندەكا ئیتالییە)**
- جڤاك دێ هنگی پێشڤەچیت و گەهیتە بەختەوەریێ كو خاندن ببیتە كارێ وانێ رۆژانە. **(سوقرات)**
- جیهان پەرتووكەكا مەزنە لێ كەسێ نەزانیت ڤەخوینیت نكاریت مفای ژ ناڤەرۆكا وێ وەرگریت. **(پەندەكا ئیتالییە)**
- ڤەخویندن و كار پێنەكرن وەكی كێلانێ و تۆڤ نەهاڤێتنێ یە. **(؟)**
- دڤێ دونیایێ دا بتنێ ئەو تشتێ دكاریت مە ژبیركرنێ قورتال بكەت پەرتووكە. **(هۆگۆ)**
- ستوینا شارستانیەتا چەرخێ بیستێ پەرتووك و وەشانن. **(رۆزۆك)**
- بتنێ سرۆشتە ئەو پەرتووكا كو هەمی بەرپەرێن وێ تەژی رامانن (معنی). **(گوتە)**
- ڤەخویندنا پەرتووكێن باش پەیڤینە دگەل خەلكێ شەریفێ بۆری. **(دكارت)**

- پەرتووك مامۆستايەكە بێ دارو قۆتان مرۆڤی پەروەردە دكەت. **(زانايەكێ ئينگليزييە)**
- پـــەرتووكێن خـــراپ ژەهـــرا هزرێنـــە و دبنـــە بناســـا رزانـــدنا مـــەژی. **(شۆپنهاوەر)**
- پەرتووكا باش مينا هەڤالێ باشە. **(روسن پير)**
- پەرتووكە جيهانا شارستانی برێڤە دبەت. **(دلتەر)**
- پەرتووكا مەزن ئەو پەرتووكە كو خوینەرێ خۆ ببەتە پێهـەلتر و مـەزنتر لێبكەت. **(ئيدوار داوراو)**
- مــن چ خەمــەك نەبوويــە ب ڤەخوينــدنا بەرپــەڕەكێ پــەرتووكێ ژ نــاڤ نەچووبيت. **(مونتيكۆ)**
- وەرزشــێ چ كــارتێكرن ل ســەر لەشــی هەنــە، ڤەخوينــدنێ ژی هــەمان كارتێكرنا ل سەر مێشكی هەی. **(؟)**
- بـێ حكومـەت دكـارين بـژين، لـێ بـێ پـەرتووك نكـارين بـژين. **(ابـراهيم لينكلن)**
- ئەو كەسـێ بەختـەوەرە ئـەوێ ئێـك ژ ڤـان دۆتشـتان لبەردەسـتی بـن، يـان پەرتووكێن باش يان دۆستێن وەسا كو هەڤالێن پەرتووكان بن. **(؟)**
- دەمێ هەست دكەی تە چ دۆست و هەڤال نەماينە سەرەدا نـا پـەرتووكخانا خۆ بكە. **(؟)**
- دەمێ ڤەخاندنێ بەس زانانە دگەل تە دپـەيڤن لـێ چـاخێ چـوويە دەرڤـە خۆپاراستن ژ مرۆڤێن نەزان و ئەحمەق كارەكێ مەحالە. **(ئيسمايلز)**
- نەهەر دڤێت ئـەم حـەژ پـەرتووكێن خـۆ يـێن بـاش بكـەين، بـەلكی دڤێـت بزاڤێ بكەين هەبوونا مە ل جياتی پەرتووكـەكا بـاش بيـت دا خـەلكێ دی چاڤ لە بكەت. **(فنلون)**
- دەمـێ بـۆ جـارا ئێكـێ پەرتووكـەكا بـاش ڤـەدخوينم هـەروەكی ناسـياريێ دگـەل دۆسـتەكێ تـازە دكـەم، دەمـێ وێ پـەرتووكێ دووبـارە ڤـەدخوينم هەروەكی دۆستێ خۆیێ كەڤن دبينم. **(ئۆليۆر كولراسميت)**
- پەرتووك باغ و بيستانێ زانايە. **(عەلی كوڕێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بيت**

# پشێمانی

- ئەڤرو ئاگرە سبەهی رەژی. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- تە چقاس رێکەکا نەراست برِی بیت هەر ڤەگەرِیێڤە. **(پەندەکا تورکییە)**
- پشتی ترِیّ قوین مچاندن یا ژ قەستایە. **(پەندەکا کوردییە)**
- نەکەرا دل کەسەرا. **(پەندەکا کوردییە)**
- چ تۆ بەرێن کچکە ل جەرِی بدەی چ جەرِی پاڤێیە سەر بەرا هەردیّ جەرِك شکێت. **(پەندەکا یۆکسلافییە)**
- خۆ ژ تورەبوونێ بپارێزە چونکی دەستپێکاویّ شێتاتی یەو دیماهیکا ویّ پشمانییە. **(عەلی کورِیّ ئەبی تالب)**
- ئەگەر پێشمانی یا بێ مفابیت ژ هەمی تشتەکی ماندیکەرترو ب ئێشترە. **(؟)**
- کەس ب خۆزیا ناگەهیتە ڤەبدێن کەزیبا. **(پەندەکا کوردییە)**
- بکەی یێ پێشمانی، نەکەی یێ سەرگەردانی. **(پەندەکا کوردییە)**

# پاداشت و خەلات

- دڤێت بەرسڤا خراپیێ ب باشیێ بهێتە دانەڤە. (؟)
- ئەگەر بەرەکی پاڤێژی دەستێ تەدێ ئێشیتن. **(پەندەکا هندییە)**
- ئەگەر گولەکا ساخلەم بیت، بکشۆژاوێ ژی دێ یا ساخلەم بیت.
- بدەو منەتا ژی نەکە، دێ ڤازانجێ وێ بۆتە ڤەزڤڕیت. (؟)
- ئەگەر تە بەرێ دارەکێ خار تا لێ نەشکێنە. **(پەندەکا فارسییە)**
- ئەگەر تەژ کانیەکێ ئاڤ ڤەخار بەرا نە هاڤێژێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەوێ ل دیڤ بگەڕێیت دێ ڤەبینیت. (؟)
- بەرهەمێ نەزانینێ شەرمکرنەو بەرهەمێ تووڕەبوونێ پێشمانی. **(پەنـدەکا ڕۆژهەلاتییە)**
- بەختەوەری و بەخت رەشیا چاخێ پیریێ بەرهەمێ کارێن مەیێن بۆرییە. **(سنت بۆد)**
- تۆچی دچینی دێ وی دروی. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەو کەسێ بڤێت ب درویت دڤێت بچینیت. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- ئەوێ فێقیەکی بخۆت پێدڤییە سۆپاسیا وی کەسی بکەت ئـەوێ دارا وێ چاندی. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- هەتا بەرێ لەپی رەش نەبیت تاما زاری خۆش نابیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئـەو کەسـێ سـەرێ وی شیشـە بیـت نابیـت بـەرا بهاڤێـژیت. **(پەنـدەکا ئینگلیزییە)**

- ئـەو كەسـێ چـالەكێ بـۆ ئێكـى بكوليـت ئـەو ب خـۆ دێ كەڤيتـە تێـدا. **(پەندەكا كوردييە)**

- هەر مرۆڤەك گرفتارێ كريارێ خۆيە. **(حيكمەت چين)**

- كارەساتێن ئیرو بەرهەمێ كارێن مە يێن دوهى نە.

- پێدڤييە مرۆڤ يێ ژ هـەژى پەسـنينێ بيـت، لـێ هـەمى گاڤـا ژێ برەڤيـت. **(فنلۆن)**

- ئەم بارا پتر كەلەما دچينين و مەلبەرە گول شين بين، ئەڤـە ژێ شاشـيەكا مەزنەو بەرۆڤاژى ياسايى سرۆشتييە. **(ئيرانشهر)**

- تەچاوا دڤێت خەلك رەفتارێ دگەل تە بكەت تۆ ژى وەسا رەفتـارێ دگـەل وان بكە. **(زەردەشت)**

- ئەگەر تۆ وازێ ل خەلكى بينى خەلك ژى دێ وازێ ل تەئينيت. **(؟)**

- ب ديتنـا مـن مـاف نەناسـى مـەزنترين لاوازييـە كـو چـێدبيت كەسـەكى هەبيت. **(ناپليۆن)**

- ب ئافەرينـــەكێ و دەســت ل پشـت دانـــەكێ دێ كـارن كەســەكى پنێرنــە گورەپانا شەرى و ب دۆ پەيڤێن رێزلێنانێ كەسـەكى پـتر چـەلەنگ بكـەن. **(پەرتووكا كاروژين)**

- ئەگەر تۆيێ دلسۆزو دلۆڤان بـى دێ ل رەخ و چـانێن خـۆ خەلكەكى بـينى كو حەژتە بكەن و خەزينا دلێن خۆ ژتەرا ڤەكەن. **(؟)**

- هەر ئێك ژمە بەرپرسێ بەختەوەرى و بەخت رەشيا خۆيە. **(بۆدا)**

- چ جارا هەمى كەس ناهێنە رازيكرن. **(لينون جانسن)**

# پارەو سامان

- کەسێ پارە نەبیت وەکی کڤانێ بێ تیرە. **(فۆلەر)**
- ئەوێ حسابا وی یا پاقژ بیت ژ لێپرسینێ ناترسیت. **(سەعدی شیرازی)**
- ئافرەندەو داهێنەرێ پارەی بۆ بکۆژێ بەختەوەریا مرۆڤی. **(سنگا)**
- مرۆڤێن کێم ئەزموون پارەی ب دیما چارەسەرا ئاریشا دزانن. **(رازبلووی)**
- ئەوێ ل سامانی نێزیك ببیتەڤە، دێ رەوشتێ بلندێ وی ژ بیرێ چیتەڤە. **(؟)**
- هەیی بە کوڕێ کەری بە. **(پەندەکاکوردییە)**
- ئەگەر تە پارە د بەرینکێ دا نەبن بلا تە هنگڤین د دەڤی دا هەبیت. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- ئەگەر تەڤیا بچییە خارنگەهێ بزانە بەرینکاتە چ دبێژیت نە ئاشك (معده). **(پەندەکا فینلەندییە)**
- چاڤبرسی هەرێ برسییە بلا هەمی جیهانا  وی بیت. **(؟)**
- پارە پەیدا کرن یا ب سانا هییە لێ پاراستنا وی یا ب زەحمەتە. **(؟)**
- ئەگەر ب دەولەمەندی بژین باشترە ژ وێ چەندێ ب دەولەمەندی بمرین. **(نۆژدار جانسون)**
- برا برایە معاملە یا جودایە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ب هەر بهایەکی بکڕی دێ ژ خەلاتی ئەرزانتر بیت. **(پەندەکا مەغربییە)**
- پەستی کێماسیەکە ب دراڤی و پلەو پایەی ناهێتە پنی کرن. **(حیجازی)**

- پارە دایکا ئاشتیێ و بابێ شەڕییە. (؟)
- پارە دێ بۆ هەوە دەرمانا ئینیت، لێ ساخلەمیێ نائینیت. (؟)
- دڤێت پارە ب مرۆڤ ڤە یێ گرێدای بیت نەك مرۆڤ ب پارەی ڤە یێ گرێدای بیت. **(پەندەکا هندییە)**
- بۆنە بازرگان یا ب ساناهییە لێ ب بازرگانی مانەڤە یا ب زەحمەتە. **(پەندەکا سویسرییە)**
- دڤێت سامانی بخازی بۆ ژیانێ نەك ژیانێ بخازی بۆ سامانی. **(لوردئاڤیبوری)**
- هەر کەسێ بانێ وی پتر بیت بەفرا وی ژی پترە. **(پەندەکا  فارسییە)**
- پارە دێ زکێ تە تێرکەت، لێ دەردوخەما دەرمان ناکەت. **(برنارد شۆ)**
- هۆش ژ زێڕی باشترو ب مفاترە. **(فۆشە)**
- دۆستێن زێڕی دزۆرن و دوژمنێن خودانێ زێڕی د بێ هژمارن. (؟)
- سامان وەکی پێپەلانکێیە دێ لێ سەرکەڤین هەتا دگەهینە ئارمانجا خۆ. **(لورد ئاڤیبوری)**
- دەولەمەند ئەو کەسە یێ مەرد بیت، هەر کەسێ خۆ ژ ڤی کاری بپارێزیت کەسەکێ بەلەنگازە. **(سوچین)**
- ئەگەر پارە نەبا ئەڤ کارەساتە ب سەر دونیایێ دا نەدهاتن. **(پەندەکا چینییە)**
- چاوا مفای ژ پارەی وەردگری وەسا مفای ژ پەیڤان وەرگرە. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- پارە دێ بۆ هەوە ناسیارا پەیدا کەت، لێ بۆ هەوە دلسۆزی و دۆستایەتیێ پەیدا ناکەت. (؟)
- پارە ب دلخۆشیەکا کێم دچیتە دناڤ ڤاسێ دا، لێ ب غەمەکا زۆر دەردکەڤیت. **(مۆلەر)**

- پاره خولامێ زەلامێ عاقلەو ئاغایێ زەلامێ ئەحمەقە. **(پەندەكا ئەلمانییە)**

- پارە باوەرا گەلەك كەسا ژێ دستینیت. **(پەندەكا فەرەنسییە)**

- ل ڤێ دونیایا پان و بەرین بگەرِیێی كەس دەرگەهی بۆ مرۆڤێ بێ پارە ڤەناكەت. **(مانری ئاستانتۆن)**

- پارەو باوەر دۆتا یێن ترازیێ نە ئەگەر تایەك بلند بوو مسۆگەر تایێ دی دێ نەڤی بیت. **(ئەفلاتۆن)**

- دارا بازرگانیێ دناڤ باغێ ئاشتیێ دا بەری ددەت. **(؟)**

- دۆ دەستەكە ژ گەنجا قەدرێ پارەی نزانن ئەوێن بێ پارەو ئەوێن زۆر خودان پارە. **(؟)**

- قەرداری تۆكا عەبدالییێیە مرۆڤ ب دەستێ خۆ دكەتە حەفكا خۆ. **(پەندەكا ئینگلیزییە)**

- بەری كرِینێ پێدڤییە هزرا فرۆتنێ بهێتە كرن. **(پەندەكا چینییە)**

- سامانەكێ كێمترو سەر ئێشانەكا كێمتر. **(پەندەكا فەرەنسییە)**

- خەلك هەمی گاڤا گوهێ خۆ ددەتە مرۆڤێ زەنگین و دەولەمەند. **(پەندەكا چینییە)**

- دەمێ كیسك خالی بۆ دل دێ تەژی بیت. **(هۆگۆ)**

- چ جارا نابیت مرۆڤ ب پارێ خۆ سەرئێشیێ بۆ خۆ چێبكەت. **(؟)**

- هەر كەسێ پارێ خۆ بۆ ب دەستڤەئینا زانینێ بمەزێخیت دێ چەند بەرامبەری وێ پاشەكەوت كەتن. **(پەندەكا ژاپۆنییە)**

- مرۆڤێ زەنگین خودانێ خەوەكا تەناو ئارامیا جانی نییە. **(غولام محسن زۆلفەقاری)**

- چ كەسەك بۆ رەخێ دارا بێ بەرو خرش ناچیت. **(پەندەكا ئەفریقییە)**

- ئـەو کەسـێ زێـڕ هـەبن یـێ خـورت و خـودان دەسـت هەلاتـە. **(سـەعدیێ شیرازی)**

- خودیکێ بۆ مرۆڤێ کورە چ مفایەك هەیە؟ **(ئسکارڤایلد)**

- مرۆڤ ب برسیاتی بنڤیت باشترە ژ چوونە دناڤ قەراڕا. (؟)

- خەلك سێ دەستەنە هندەك خولامێن پارەینە، هندەك هەڤالێن پارەینە، هندەك ئاغاییێن پارەینە. **(دیل کارەنگی)**

- زەلامـێن خـودان هێـز ژ هـەمی کەسـان باشـتر دزانـن کـو پـارە مـەزنترین دەست هەلاتە. (؟)

- چـال دێ هێنـە پڕکـرن بـەس دلـێن خـەلکی ناهێنـە پڕکـرن. **(پەنـدەکا چینیە)**

- سامان وەکـی مێشا هنگڤینییـە ئەگـەر ب جـوانی چاڤێ خـۆ بـدەییێ دێ هنگڤینی دەتەتـە، لـێ ئەگـەر خەمسارییێ ددەرحـەقێ وێ دا بکـەی دێ ب تەڤە دەت و فڕیتن. **(نۆژدار مارتن)**

- هنــدەك جــارا دەنگــێ پــارەی گازیــا دادپــەروەرییێ دکوژیــت. **(پەنــدەکا یوگسلافییە)**

- من بڕیارا دای پارەی بێخمە د خزمە تا خـۆدا، نـە خـۆ بێخمـە دخزمـەتا پارەیدا. **(جان راکفدەر)**

- چ جارا ب پارەی سەربازەکێ باش و مامۆستایەکێ باش و هۆنەرمەنـدەکێ باش ناهێتە چێکرن. **(رۆسگین)**

- دراڤێ سپی بۆ رۆژا رەشە. **(پەندەکا کوردییە)**

- زانست تاجێ سەرییەو سامان تۆکا گەردەنێ. (؟)

- پـارە ب راسـتی ب زمانـەکێ وەسـا دئاخڤیـت هـەمی مللـەتێن جیهـانێ لـێ تێدگەهن. **(ئافرابن)**

- ئەو کلیلا سندوقا پارا ڤەدکەت دێ فەڕاشا دلا ژی ڤەکەت. (؟)

- ئەو کەسێ شیانا گرێنژینێ نەبیت دڤێت دوکانێ ڤەنەکەت. **(پەندەکا چینییە)**
- مللەتێ بێ پارە ترانا ب سەر ب خۆیا خۆ دکەت. **(پەندەکا هنگارییە)**
- ترازیا کێ زێڕ تێدابن یێ خورت و خودان دەست هەلاتە. **(سەعدیێ شیرازی)**
- مەردایەتی ب دلییە نە ب مالییە. **(پەندەکا کوردییە)**
- د دونیایێ دا هەرگاڤ مە نیعمەتەك دڤێت چاخێ گەهیشتە دەستێ مە دبیتە دوژمنێ جانێ مە. **(حیجازی)**
- گۆڕەپانا دەولەمەندیێ وەکی گۆڕەپانا شەڕی یە کەسێن ب جەرگ و خۆڕاگر دڤێن. **(ج.پ)**
- هەرکەسێ هەژارو قانع بیت یێ دەولەمەندە. **(شکسپیر)**

# ژیان

- ئەگەر ژیانێ ب ساناهی بگری، دێ ژیێ تە ب خۆشی دەرباز بیت. **(عەزیز نەسین)**
- ئەو کەسێ عەبدال و ئەسیرێ عادەتا بیت یێ هەژی ژیانێ نییە. **(؟)**
- بێی هەبوونا ئارمانجەکا دیار، ژیانێ چ تام تێدا نییە. **(کولانی)**
- هزرێ ل ژیانی بکەنەڤە. لێ خەما پێشڤە نەخۆن. **(دیل کارەنگی)**
- بۆ هندێ ب باشی بژی گەرەکە ل ژیانێ پێهەل بی و فێربری ژێهەل بچی و فێر ببی ل خارێ بنێری. **(نیچە)**
- مەزنترین هۆنەرێ ژیانێ بەهرە وەرگرتنە ژوان دەلیڤێن بێ وێنە ئەوێن د بەرمەرا دەربازدبن. **(سالرئیلێ)**
- پرانیا سەختیێن ژیانێ ژ بەر هندێ نە کو ئەم بزاڤێ دکەین ژ راستیا وان برەڤین. **(غولام محسن زولفەڤاری)**
- بۆ خارنێ نەژی، بەلکی بخۆ بۆ ژیانێ. **(پەندەکا ئەمریکییە)**
- تۆ نانی دخوی و یێ ساخی، ئەز نانی ددەم و دژیم. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- گرنژین باشترین چەکێ شەرییە بۆ ژیانێ. **(ئانا تول فرانس)**
- گرنژین ئاریشەو نەخۆشییێن ژیانێ کچکە دکەتەڤە و دەردێن جانی ژ ناڤ دبەت. **(ژول سیمون)**
- بەختەوەر ئەو کەسە یێ ل ژیانا کەسێن دی فێرە پەند دبیت. **(جواد فاضل)**
- د ژیانێ دا سامانێ راستین دلۆڤانییەو بێ خودانیا راستین خۆپەرستییە. **(ڤینە)**

- سامانێ زۆر مینا هەژاری و پەریشانییێ ژیانێ تەحل و نەخۆش دکەت. **(حیجازی)**
- دلێ مرۆڤی ب ژیانێ ڤە یێ گرێدای نییە ب باشییێن وێڤە یێ گرێدایە. **(سوقرات)**
- ژیان هەمی فێربوونە، چونکی ژیان بەردەوام یا د پێشڤەچوونێ دا. **(لابۆلاید)**
- ژیانا مرۆڤی، ئانکو هزرکرنەڤا وێ یا رۆژانەیە. **(ئەمرسۆن)**
- ژیان رازانەو ڤیان خەونا وێیە. **(مرسرێ)**
- بتنێ شەوڤا ژیانێ پاسەپۆرتا ژیانێ یە. **(یەتودۆپارکەر)**
- ژیان دەریایەکا مشتی پێلە ئەو کەس دکاریت تێدا نەخەنـدقیت یـێ د ناڤ هۆنەرێ وێدا مەلەڤانەکێ بستەبیت. **(ج. پ)**
- ئارمانجا هۆنەرێ ئیرو ژیانە نە جوانی. **(ڤیکتۆر هۆگۆ)**
- هەر رۆژەك بۆ مرۆڤێ ژیر ژیانەکا تازەیەو دڤێت تۆلا شاشییێن بۆری بکەتەڤە. **(؟)**
- ساتەکێ پتر ژیان باشترە ژ هزار سکێن زێری. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- مرۆڤی د ژیانێ دا دۆستەکێ ژ خۆ باشتر نییەو دۆژمنەکێ ژ خۆ خراپتر نییە. **(ئەبو عەلا)**
- رۆژەکا ژیانێ یا رۆناهییە ئێکا تارییە ، ل رۆژێن رۆناهی بلا هند قاس رۆناهیێ وەرگرین دا رۆژێن خۆییێن تاری پێ رۆناهی بکەین **(حیجازی)**
- من پەرتووکەك و مامۆستایەك هەبوون، پەرتووکا من ژیان بوو، مامۆستایێ من ژی جەرباندن و ئەزموونێن ژیانا من بوون. **(؟)**
- ب گریڤە تۆ ژ دایك دبی، وەسا بژی کو ب کەنیڤە ژ دونیایێ بچی. **(؟)**
- ژیان یا پێکهاتی ژ بزاڤ و کارکرنێ. **(محمد تەقی بهار)**
- ژیان خەوەکە، ڤیان خەونا وێیە. **(ئەلفردۆ مۆسێ)**

- دونیا وارە نە مالە. **(ج. پ)**

- زۆر ژیان نەیا گرنگە، بکارئینانا ژیانێ یا گرنگە. **(هولارد)**

- پێدڤییە ئەم سنۆرێ خۆ بنیاسین کو ئەم دڤێ دونیایێ دا تشتەکین، بەلێ ئەم هەمی تشت نینە. **(پاسکال)**

- ئەگەر تەخۆ دۆڕاند بلا هەمی دونیایێ بیەیەڤە ماچ مفایەك هەیە. **(؟)**

- دونیا هند ڤاس یا بەرفرەیە جهێ هەمی کەسا یێ تێدا هەی، ل جیاتی هندێ جهێ کەسەکی بگری پێکۆلێ بکە جهێ خۆ یێ راستەقینە پەیدا بکە. **(چارلی چاپلن)**

- ژیانا مرۆڤی د دونیایێ دا وەکی دلۆپەکا ئاڤێ یە ژ دەریایەکێ **(؟)**

- چار رەنگە مرۆڤ دونیایێ دا دژین، ئەڤیندار، دەست هەلات خاز، خیال رێس، شێت. **(تن)**

- د هەمبەر ئاریشادا مینا چییا یێ خۆ راگربە کو کەسەك نەکاریت تە بهژینیت. **(؟)**

- تو چ بچینی دێ وی دروی. **(پەندەکا کوردییە)**

- دونیا د هەمبەر بوونەوەرێن دی دا وەکی میحرابەکا بچیکە کو دناڤ پەرستگاهەکا مەزندا بهێتە چێکرن. **(لورد ئاڤیبوری)**

- هەمی گاڤا ل بیرا هەوە بیت کو دونیا قەرداری هەوە نییە، چونکی بەری هەوە ژی یا هەبووی. **(جان نستیل)**

# ژن ئینان و شویكرن

- ژ سوقرات هاته پرسین ژن ئینان باشتره یان نه ئینان؟ بەرسڤ داڤه د هەردوو حالەتادا هەر پشێمانییه. **(سوقرات)**
- ئەو ژن ئینانا ب پارەی چێدبیت ب پارەی ژی دێ ژ ناڤێ چیت. **(رولاند)**
- ژن ئینان وەكی باژێرەكێ دۆرپێچكرییه (محاصره) ئەوێن دناڤ باژێرێ دا پێكۆلێ دكەن ژێ دەركەڤن، ئەوێن دەرڤەی باژێری پێكۆلێ دكەن بچنه د ژۆرڤە. **(فرانكلین)**
- ئەگەر كەسەكی هەڤژینا خۆ وەكی وی دڤێت هەلنەبژارد، ئەڤه وی دۆ كەس بەخت رەش كرن. **(حیجازی)**
- ژن ئینان بۆ بەرژەوەندیا كەسێن دی دێ ژیانێ كەته دۆزەخ. **(شۆپنهاوەر)**
- بۆ زەلامی زانینا فەره، بۆ ژنێ دامان پاكی. **(ژۆرژ هێربرت)**
- ئەگەر هوین بخازن هەڤبیریا هەوە د مالێ دا هەرا بەردەوام بیت خۆ ژ جرەو لۆمەكرنێ بپارێزن. **(دیل كارنگی)**
- ژن ئینانێ ژ چوونه شەری پتر مێرخاسی دڤێت. **(گریستین)**
- سەخمەراتی هەبوونا ژیانەكا تەناو بێ كێشمەكێش دڤێت زەلام یێ كەربیت ژن ژی یا لال. **(سروانتس)**
- ژن ئینان وەكی شفتی یه جارەكی یێ باشه، گەلەك جارا یێ خرابه. **(پەندەكا ئەستەنبۆلییه)**
- ژنێ نه بژێره ئەسل خێره. **(پەندەكا كوردییه)**
- ژن وەكی كەتا گویزێ یه هەمی كەس دێ بەرێ خۆ هاڤێنێ كا كی دێ لێدەت. **(پەندەكا كوردییه)**

- ژن ئینان وەکی دانانا پیلانا شەڕی یە، ئەگەر جارەکی شاشیێ بکەی، هەتا هەتا تولاوێ ناهێته ڤەکرن. **(بۆرنز)**

- ژنێ بینه بلا یا چاوا بیت، ئەگەر یا باش بیت ئەڤه دێ بەختەوەر بی، ئەگەر یا خراپ بیت دێ بییه فەیلەسوف، ئەڤه ژی بۆ هەر زەلامەکی تشتەکێ باشه. **(سوقرات)**

- هەلبژاردنا دایك و بابا ددەستێ مرۆڤی دانییه لێ هەلبژاردنا دایکا زەلامی و دایکا ژنێ یا ددەستێ مرۆڤی دا. **(خاتۆینا پرل)**

- زوی ژن ئینان شاشیەکا زۆرا مەزنە، درەنگ ژی ژن ئینان شاشیەکا ژوێ مەزنترە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**

- باشترین دەرگەڤانێ بەختەوەریێ د هەر مالەکێ دا ڤیانا ژن و مێرایە بۆ ئێك و دوو. **(دۆمۆن لوزید)**

- کچا ژیرو عاقل شوی ب پیرە مێرەکی ناکەت کویێ دەولەمەند بیت، دێ شوی ب گەنجەکی کەت بلا یێ هەژار بیت. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- دوو رەنگێن ژنا هەنە، دێ ب ئێکێ دەولەمەند بی، دێ ب ئێکێ هەژار بی. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- براستی ژن ئینان وەکی بەترمە کرنێ یە کو ل دارەکێ بۆ دارەکا دی دهێته کرن، ئەگەر باش گرت دێ بەر پێڤەهێت، لێ ئەگەر نەگرت دێ هەردوو هشك بن. **(سەعید نفیسی)**

- ژن گولەکە کەلەمێن تیژێن هەی. **(؟)**

- پێدڤییە زەلام مێشکێ مالێ و ژن دلێ مالێ بیت. **(سرۆس)**

- ژنەك دێ یا بەختەوەر بیت کو یا گوهداری زەلامێ خۆ بیت. **(پەندەکا یۆنانییە)**

- جوانیا ژێ وەکی ئامیرەکێ تیژە کو ددەستێ زارۆکەکی دا بیت، ڤێجا هەم بۆ وی هەم بۆ کەسێن دی جهێ مەترسیێیە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- ژنا گوهدار قوماندارا دلێ زەلامێ خۆییە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**

- بەری بچیە شەڕی جارەکی ژ خۆدێ پارە پارێ بکە، پێشی بچییە ناڤ دەرییایێ دا دووجارا ژ خودێ پارە پارێ بکە، بەری ژنێ بینی سێ جارا ژ خودێ پارەپارێ بکە. **(زانایەکێ پۆلندی)**

- ژنا ژیرو خودان هۆش ئەگەر زەلامێ وێ یێ بێ پارە ژی بیت دێ ب باشی دگەل قەتینیت. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- ژیانا خێزانی وەکی کۆمپانیایەکێ یە چقاس پشکداریکرنا ژن و مێرا تێدا پتر بیت هێزا وێ و مانەڤا وێ دێ پتر بیت. **(سەعید نەفیسی)**

- کچەکێ هەلبژە کو دایکا وێ یا باش و رەسەن بیت. **(پەندەکا چینییە)**

- بەردەوام بوونا ژیانا ژن و مێرا یا ژ دە پشکا پێکهاتی پشکەك ڤیان و حەژیکرنە نەهـ پشکێن دی یێن ژ لێبۆرینێ و چاڤپۆشییێ پێکهاتی. **(پەندەکا ئسکۆتلەندییە)**

- ژنا باش ب زەلامێ خۆڤە یا هەڤبەندە هەڤیژینێ وێ حەژ چدکەت ئەوژی پێڤەیا گرێدایە. **(دیل کارەنگی)**

- چاخێ ژن ئینانێ پتر مشورەتێ دگەل گوهێن خۆ بکە ژ چاڤێن خۆ. **(پەندەکا ئەلمانییە)**

- هەر کەسێ ل بەهەشتا دونیایێ بگەڕیێت بلا رێکا مالا خۆ بگریت و بەرنەدەت. (؟)

- هەر جڤاکەکێ پێدڤیا ب رێبەرەکی هەی، رێبەرێ مالێ ژی زەلامە. **(ناپلیۆن)**

- نەزانترین کەس ئەون یێن کو بۆ خاترا بەرژەوەندیا کەسێن دی ژنێ دئینن یان شوی دکەن. **(شۆپنهاور)**

- ئەو مالا ژنەکا پاقژو دامان پاك تێدا نەبیت گورستانە. **(بالزاك)**

- بۆ پەیداکرنا ژنەکا باش هندێ دئینیت پێلاڤەکی پێڤە بدڕینی. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- زاڤایەکێ کرێت و خودان کەسایەتی باشترە ژ زاڤایەکێ کەشخەو ژێنەهاتی. **(پەندەکا پۆلەندییە)**

- بۆ هندێ تاڤیکرنەوا بۆ ژن ئینانێ ب دەست ڤە بینی گەرەکە جارەکی ببیە زاڤا. **(پەندەکا فەرەنسییە)**

- نەخۆشی و تالی و سویریی باشترین جەرباندنن بۆ ژیانا ژن و مێرا، چونکی دێ رەوشتێ وانێ راستین دناڤ ڤان نەخۆشیان دا دەرکەڤیت. **(ئیسمایلز)**

- بەری ژن ئینانێ چاڤێت خۆ باش ڤەکەن، لێ پاشی ژن ئینانێ کێمەکێ ل سەر ئێك دانن. **(فرانکلین)**

- ژنەکێ بکە هەڤژینا خۆ، کو ئەگەر ئەو ژن زەلام با ببا باشترین دۆستێ تە. **(بردون)**

- دەمێ کڕینا قوماشی باش ل رەخێن وی بنێڕن، هەروەسا چاخێ وەڤیا کچەکێ بخازن لێڤەکۆلینێ ل سەر دایکا وێ بکەن. **(پەندەکا ئازەربایجانییە)**

- ئەگەر تە ڤییا کچەکێ بینی بەرێ خۆ بدە دایکا وێ کا یا چاوانە. **(پەندەکا کوردییە)**

# ژن

- ئەگەر ژن نەبا کی دا بلیمەتێن جیهانێ پەروەردەکەت. **(ناپلیۆن)**
- ئەگەر تەبڤێت ئاستێ پێشڤەچوون و شارستانیەتا مللەتەکی بزانـی بنێـڕە ژنێن وی مللەتی. **(ناپلیۆن)**
- هەسـپا ژ خانـەدانێن دەولەمەنـد بکـڕەو ژنـا ژ خانـەدانێن هـەژار بینـە. **(پەندەکا ئستیوانییە)**
- هەسپێ بێ لغاڤ و ژنـا بـێ تـۆرە مرۆڤـی بـەرەڤ نـەمانێ دبـەن. **(پەنـدەکا چینییە)**
- ژنێ ئەگـەر تـە بڤێـت بهێیـە بـەردان سـلاڤ نەکـە خەسـیا خـۆ؟ **(پەنـدەکا فەرەنسییە)**
- خۆشکاندن جوانیا ژنێیە. **(پەندەکا هندییە)**
- مێرێ شەرمین دئینیتن کارەکی، ژنا شەرمین دئینیتن شارەکی. **(پەنـدەکا کوردییە)**
- ژنێ نە بژێرە ئەسل خێرە. **(پەندەکا کوردییە)**
- مەزنترین دوژمنێ ژنێ تورەیی و ناڤ چاڤ گرژییا  وێیە. **(پل ژانە)**
- روویمەتێ ژنێ نوینەرێ زەلامێ وێ یەو کراسێ زەلامی پێناسـا ژنـا وییـە. **(پەندەکا یۆگسلافییە)**
- ل دەستپێکا هەر کارەکێ گرنگ ژنا بەرهەڤە. **(لامارتین)**
- چـاخێ ژنـێ هەلدبـژێری ئێکـا ژ خـۆ نـەڤیتر لبەرچـاڤ بگـرە ، وە چـاخێ هەڤالی هەلدبژێری بلا پلەکێ ژتە پێهەلتربیت. **(پەندەکا چینییە)**

- ژنـا عاقـل مـالا خـۆ ئاڤـەدان دكـەت وە ژنـا نـەزان مـالا خـۆ كاڤـل دكـەت. **(تريستان برنارد)**

- ژنا باش گوهێ خۆ ددەتە سێ كەسا، بـابێ، زەلامـێ خـۆ، كـوڕی. **(پەنـدەكا ژاپۆنييە)**

- ژن كليلا مالێيە هۆشيارىن بەزر نەكەن. **(پەندەكا ژاپۆنييە)**

- ئەوێ ژنەكا باش ب دەستڤەبينيت، مـەزنـترين سـامانێ ب دەسـتڤە ئينـای. **(پەندەكا چينييە)**

- كچێ بەس مێر دڤێت لێ چاخێ شويكر هەمی تشت دڤێت. **(شكسبير)**

- بهـا گـرانـترين جـوانی كـو چ ژن ژێ د بەهرەمەنـد نـەبن بـێ دەنگييـە. **(پەندەكا يۆنانييە)**

- مێر ئافرەنـدێن كـارێن گـرنگن، ژن ژی ئـەوان دئيننـە گـۆڕێ و هـەبوونێ. **(رۆمن رۆلان)**

- شرينترين گۆتن د ژيانێ دا ئەو گوتنە چاخێ ژن ب دلـەكێ سـاڤ ب خێـر هاتنەڤا زەلامێ خۆ دكەت. **(جۆرج ڤۆلز)**

- ئێكەمين كەسێ كو دكاريت ژنێ ب سەردا ببەت ئەو ب خۆيە. **(لافۆنتن)**

- جوانيا ژنا بێ تورەو شەرم وەكی تورا دڕيايا ماسی گرتنێ يە. **(ئەمرسۆن)**

- هەر زەلامەكێ بناڤ و دەنگ ژنەكا مەزن يا ل پشت پشتێ هەی. **(؟)**

- ژنا عاقل دگەل زەلامێ بێ سامان د گۆنجيت. **(پەندەكا رۆسييە)**

- سـێ گـديێن ل دنـێ : يـێ بچـيتە رێكـێ بـتنێ، يـێ ل ئـەفرازی بكێشـيت تويتنێ، يێ مالا خۆ ببەتە دەڤ مالبابا ژنێ. **(پەندەكا كوردييە)**

- زۆر گـولێن جـوانێن هـەی بـەس بـێن ژێنـا هێـت، هەروەسـا زۆر ژنــێن كەشخەيێن هەی خۆشتڤی نينە. **(هوئل)**

- بەختەوەرترين ژن ئەو ژنە يا پاشی شويكرنێ. زەلامێ خۆ دكەتە باشـترى زەلامێ جيهانێ. **(نيوتن)**

# دفن بلندی

- ژ خۆڕەڤین باشترە ژ خەلکی رەڤینێ. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- ئاڤاهیێ باشیێ و رزگاریێ ل سەر بناغێ خۆنیاسینێ یێ موکمە. **(؟)**
- تو چەند ب چاڤەکێ کێم دنێریە خەلکی، خەلك ژی هند ب چاڤەکێ کێم دنێڕیتەتە. **(؟)**
- ئەگەر تە کەسەك دیت ب تە نەگرتژی بزانە بناسێن لێڤێن تە یێن قەپاتن. **(؟)**
- ل جهەکی روینە کو تە ڕانەکەن. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- خۆنیاسینێ ب سامانەکێ مەزن بزانە. **(خواجە عبدالله ئەنساری)**
- جوانترین تاجێ کو خەلك دادئینتە سەرێ خۆ د ناڤ کویرا ئاگری دا دهێتە چێکرن. **(چارلی چاپلن)**
- زیانا وێ کێماسیێ ژ هەمیا پترە ئەوا ل دەڤ خودانێ وێ یا ڤەشارتی بیت. **(جالینۆس)**
- سێ تشت زۆر سەختن: پویلا، ئەلماس، خۆنیاسین. **(فرانکلین)**
- زلکی دچاڤێ خەلکی دا دبینیت، لێ گێسنی د چاڤێ خۆدا نابینت. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەو کەسێ ژ خۆ رازی بوو دوژمنێن وی دێ زۆربن. **(ئیمام هادی)**
- ئەوێ بڤێت حوکمی ل خەلکی بکەت دڤێت بەراهیکێ حوکمی ل خۆ بکەت **(فیلیپ ماسینجەر)**

- مرۆڤێ دفن بلند یێ بەرهەڤە وندا ببیت و پرسیارا رێکێ ل یێن دی نەکەت. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- ئەم کەس خودان عەقل و بۆچوون زێرین نزانین، بەس ئەو نەبن ئەوێن هەڤبیرو باوەر دگەل مە. **(لارشفۆگۆ)**
- ئەم حەز ناکەین یێن دی ب خاپینین، لێ ئەم ژ خاپاندنا یێن دی پەندا وەرناگرین. **(پاسکال)**
- ئەم د زانین کا ئەم تشتین، لێ ئەم نزانین کا دێ بینە چ تشت. **(شکسبیر)**
- بەراهیکێ دێ بێژنەتە هۆنەرێ تە چییە نابێژنەتە بابێ تەکییە. **(سەعدی. ش)**
- توخمپەرستی ژ خۆ پەرستیێ خراپترە. **(هاری هۆرتۆن)**
- چقاس مرۆڤ هێزاتر بیت دفن بلندیا وی کێمترە. **(پەندەکا دانیمارکییە)**
- قەت و قەت تشتەکێ رەوا نییە بێژین ئەز دبێژم. **(مارام نکار)**
- هەر چەندی مرۆڤ بلند ببیت کە فتناوی خورترە. **(پەندەکا لاتینیە)**
- هەمیا لبەرە مرۆڤایەتیێ بگۆرن، لێ حەیف کەس لبەر نییە خۆ بگۆریت. **(تۆلیستی)**
- هەستا خۆ مەزن کرنێ ل دەڤ هەمی خەلکی هندی ئێکە بەس جوداهییا ل تەرزێ دەرئێخستنا وێدا هەی. **(حیجازی)**
- بەختەوەری هنگی دەست پێدبیت چاخێ دەست هەلات خازی ب دیماهیك دهێت. **(پەندەکا هەنگارییە)**
- دفن بلندیا ژنان مەزنترین بناسا بەخت رەشیا وان و هرفینا مالباتایە، چ تشتەك وەکی خۆ مەزن کرنا ژنان بناغێ مالبات و خێزانا وێران نەکریە. **(چارلی چاپلن)**
- ل بەفرا سەربانێ هەڤسویێ خۆ گازندێ نەکە، چونکی هێشتا پێشیا خانیێ تەیا پیسەو تەژی بەفرە. **(کنفوسیۆس)**

# دەم و دەلیڤە

- مرۆڤێ عاقل دەلیڤا باش دێ کەتە بەختەکێ باش. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- دەلیڤە شیرە ئەگەر نەبڕی دێ تەبڕیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- ساتەکێ شاشی کرن ژییەکی دێ خەما دیڤ خۆڕا ئینیت. **(پەندەکا چینییە)**
- شولا ب وەقتی وەکی پاشایێ سەر تەختی. **(پەندەکا کوردییە)**
- مەزنترین هۆنەرێ ژیانێ بەهرە وەرگرتنە ژ وان دەلیڤێن زێڕین یێن د بەر مەڕا دەرباز دبن. **(سالرائیل)**
- بەس دەم نەبیت هەمی تشتەکێ دی چێدبیت بهێتە کڕین. **(پەندەکا سویسرییە)**
- هندەك دایباب هەنە هەمی تشتەکی ژ بۆ زارۆکێن خۆ دمەزێخن بەس دەمێ خۆ نەبیت. **(موریس سایتەر)**
- بتنێ سامان و سەرمایێ بهاگرانێ مە کاتە ئەگەر چوو ئیدی ڤەنازڤڕیت. **(ئیسمایلز)**
- ئاسنێ سۆرڤەکری دڤێت بهێتە قوتان بەری سار ببیت. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- دبارا دەمێ خۆ دا بلا مرۆڤ یێ رەزیل بیتن. **(توربۆ)**
- دۆستێ دزی دەمە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- دەم هژمێرێن سپێدێ زێڕێن دناڤ دەڤی دا هەی. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- ئەگەر تۆ نەزانی ئەڤرو چ دقەومیت شانازیێ ب سبەهی ڤە نەکە. **(سلیمان)**

- دەلیڤـە گرانبهـاترین تشـتە ل گرانبهـاترین کـاردا بمەزێخـە. **(سـەهل بـن عەبدوللا)**
- دەلیڤـێن زێـڕین پێپـە لانکـێن بەختـەوەریا مرۆڤـێ عـاقلن. **(پەنـدەکا یۆنانییە)**
- کارێ ئیرو نەهێلە سبەهی. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەم هەمی بچیکێن دەمینە. **(شەفر)**
- تشتێ دیار نەدە ب یـێ بـەزر، وە تشـتێ هـەی ب تشـتێ نەهـەی نەفرۆشـە. **(خواجە رشیدالدین)**
- دەم مینا پێلێن دەریا ل هیڤیا کەس نامینیت. **(؟)**
- کارەکێ زۆرێ دروستە ئاسنی ب قوتین هێشتایێ گەرم لێ دروست تـر ژوێ ئەوە ب قۆتانێ گەرەم بکەین. **(کرامۆل)**
- دەم زێڕە. **(؟)**
- هەر رۆژەکا تە پەیامەکە بۆ سبەهی. **(ئێقبالێ لاهۆری)**
- ل هـەر جهـەکی ئەگـەر درەنـگ ڤێـڕا بگـەهی باشـترە کـو هـەر نەچـی. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- مەترەکا زێڕی نکاریت مەترەکا دەمی بکڕیت. **(پەندەکا چینییە)**
- دەم هـژمێرەکا سـپێدێ ل دۆ دەم هـژمێرێن شـەڤێ باشـترە. **(پەنـدەکا ئەفریقییە)**
- دەم گرانترین سامانێ مرۆڤییە. **(اعتصام الملك)**
- دەلیڤـە یـا کەڤتیـە بـن پییـا دەسـتا ببـە هـاری دا راکەیەڤـە. **(پەنـدەکا ئینگلیزییە)**
- ما کی دێ کارێ ئەڤرو هێلیتە سبەهی، چونکی هـەر رۆژەکـا بهێـت کـارێ خۆ دگەل خۆ دئینیت؟ **(ئەبو فەزل بەیهەقی)**
- ئەوێ مفای ژ دەلیڤێ وەرنەگریت کولاڤێ وی یێ ل پشت گوڕەپانا شـەڕی. **(پەندەکا ئیتالییە)**
- زیڤێ ئامادە باشترە ژ زێڕێ ڤەر. **(ج. پ)**

# دۆست و هەڤال

- تۆ دۆست و هەڤالێ کێی دا بێژمە تە تۆ چ مرۆڤەکی؟ **(ئەمرسۆن)**
- دۆستا بگرە ب ڤەسپەکێ ژ خۆ نەکە ب هەسپەکی. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- ئەگەر تە بڤێت دۆستا پەیداکەی دڤێت تۆ یێ ژ هەژی پەیداکرنا دۆستان بی. **(مۆرا)**
- دۆستێ نەفسێ یێ زیزە. **(پەندەکا کوردییە)**
- دۆستێن دروست ئەگەر ل پێش چاڤا ژی بچن ژ ناڤ دلا ناچن. **(سیرۆن)**
- من پرسی دۆست باشترە یان برا، گۆت دۆست ئەو برایە یێ کو مرۆڤ ل دیڤ حەزو مەیلا خۆ هەلدبژێریت. **(ئەمیل فاگۆ)**
- ئەوێ سێ دۆستێن خۆ ژ دەست دابن کەسێ چوارێ دێ بیتە دۆستێ وی. **(لاڤاتر)**
- جوانی و کەشخە یا مالێ ئەو دۆستن یێن هاتن و چوونا وێ دکەن. **(ئەمرسۆن)**
- ئەو کەس دۆستێ منە یێ قەدرێ من بزانیت و بهاو رێزێ بۆ من دادتینیت. **(ئالبێرت هۆبات)**
- دۆست ل جیاتی چەترێ دڤێت رۆژێن باران دگەل هەوە دابیت. **(پۆل نرۆلا)**
- دۆست دزێ دەمییە. **(پەندەکا ئەسپانییە)**
- بتنێ لۆمەیا دۆستان بکەو دناڤ خەلکی دا پەسنا دۆستان بکە. **(پەندەکا لاتینییە)**
- دۆستێ هەمی کەسا دۆستێ چ کەسا نییە. **(یوردالۆ)**

- ئەو کەسێ ژییەکی هەڤالێ تە بیت ب گاڤەکێ ژ دەست خۆ نەکە. (؟)
- دۆستایەتی ب هەڤ گەهیشتنا دوو جانایە کو چ جارا نەکارن ژێکڤە ببن و ژ هەڤ جودا ببن. **(ڤیلتەر)**
- دۆستایەتی گیایەکە دڤێت هەر چەند دەما جارەکی بهێتە ئاڤدان. (؟)
- حەژ دۆستێ خۆ بکە، بەس تە ئاگەهـ ژ خۆ هەبیت. **(پەندەکا ئسکۆتلەندییە)**
- دۆستێن تە گەرەکە مینا وان پەرتووکێن تۆ ڤەدخوینی دکێم بن و هەلبژارتی بن. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- دۆستێن دلسۆز رۆژێن تەنگاڤیێ دەردکەڤن. **(پەندەکا کوردییە)**
- دۆستێن دلۆڤان ژ برایێن نە دلۆڤان باشترن. **(پەندەکا چینییە)**
- ئەو کەسێ دۆستەکێ باش هەبیت پێدڤی ب خودیکێ نییە. (؟)
- کێم حەژ من بکە بەلێ بەردەوام حەژ من بکە. **(کریستۆفر مارلۆ)**
- ئەو کەسێن ژیانێ بێ دۆست دهێلنەڤە هەروەکی جیهانێ بێ هتاڤ دهێلنەڤە. **(سیسرون)**
- خەسلەتێن هەر کەسەکی گرێداینە ب باشی و کێماسیێن خۆڕەوشتێن دۆستێن ویڤە. **(کارلایل)**
- هەر ئاریشەکا دگەل دۆستان بهێتە باسکرن، یا ب ساناهییە. **(محمد حیجازی)**
- نیشانێ دۆستێ باش ئەوە کێماسیاتە دابپۆشیت و شیرەتا ل تە بکەت و نەپەینێن تە ئاشکرا نەکەت. **(بۆ عەلی سینا)**
- دیما ئارمانجا خەباتا مە دۆستایەتی کرنە دگەل هەمی خەلکێ دونیایێ. **(گاندی)**
- هەر چقاس دۆستێن هەوە کێمتر بن هند قاس دێ پتر هەست ب بهایێ دۆستایەتیێ کەن. (؟)

- دۆستێ تە ئەوە یێ تە بگرینیت، دۆستێ تە ئەو نییە یێ تە بکەنینیت. **(پ. کوردییە)**
- دۆستەکێ باش چێترە ژ سەد خزم و کەسێن خراپ. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- شتلا دۆستایەتیا راست هێدی هێدی وەرارێ دکەت. **(جورج واشنتۆن)**
- بتنێ رێکا دۆست پەیداکرنێ ئەوە ئەم بەراهیکێ حەزا دۆستایەتیێ دەربڕین. **(ئەمرسۆن)**
- هەر چاوا ئەڤیندارێن راستەقینە کێمن، وەسا ژی دۆستێن راستەقینە کێمن. **(لارشفۆگۆ)**
- من د دونیایێ دا دۆستەك هەبوو ئەو ژی ئەز بووم. **(ناپلیۆن)**
- دۆستێ باش دزانیت جۆکا ئاڤێ سەر چڕادچیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئێشاندنا دلێ دۆستا حاسلکرنا مرادا دوژمنایە. **(؟)**
- ئەگەر تە ڤیا دوستەکی هەلبژێری، چاخێ تورەبوونێ وی بجەربینە، ئەگەر یێ ب وژدان بوو یێ ژ هەژی دۆستایەتیێ یە ئەگەر نە خۆ لێ بپارێزە. **(لقمانێ حەکیم)**
- ئەو کەسێ ژ خەسلەتێ باشێ یێ بەهرەمەند بیت چ جارا بتنێ نامینتەڤە، چونکی دێ هەر گاڤ دۆستان بۆ خۆ پەیدا کەتن. **(کنفوسیۆس)**

# دادوەری (قەزاوەت)

- مرۆڤێ تورە نکاریت راستیێ ببێژیت. (پەندەکا چینییە)
- مرۆڤ دڤێت کولاڤێ خۆ بەری خۆ بکەتە قازی. **(پەندەکا ئیرانییە)**
- ئەوێ ئێکی دگرینیت دێ کەنیا ئێکی دی ئینیت. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- ئەگەر گەردەنا سویچبارەکی بهێتە ئازادکرن باشترە ژ وێ چەندێ کو بێ تاوانەك بهێتە سزادان. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- ئەو بارێ هەلنەگری تۆ نزانی چقاس یا گرانە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- هەر کەس قازی ژ خۆیێ رازی. **(پەندەکا کوردییە)**
- کەس نابێژیت دۆیێ منێ ترشە. **(پەندەکا کوردییە)**
- بێژە من کی کەس جهێ پەسەندا تەیە دێ بێژمەتە کا تۆ کی کەس و تە چ هۆش و سەلیقەك هەیە. **(سن بوو)**
- قازی دڤێت گۆتنا هەردوو ئالا گوهداری بکەت. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- نابیت ل سەر روویمەتێ دەرڤە دادوەریێ بکەی. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- دەست نیشان کرنا کێماسیا باشترە ژ دیتنا کێماسیا. **(دیل کارەنگی)**
- خوینا هەمی مرۆڤا یا سۆرە لێ ژێهاتنێن وان نە وەکهەڤن. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- نابیت چاخێ دادگایکرنا مریشکێ رویڤی ببیتە قازی **(پەندەکا چینییە)**
- زمان سەبارەت هەمی تشتەکی دادوەریێ دکەت. **(پەندەکا یونانییە)**

- روویمەتێ هەوە پەرتووکەکە خەلك دکاریت تشتێن عەنتیکە و سەیرو سەمەرە لێ ڤەخوینیت. **(شکسبیر)**

- خەلکێ نەزان و نەخوێندەوار رێزێ ل کەسێن دەولەمەند دگرن، لێ مرۆڤێن تێگەهشتی و ژیر رێزێ ل کەسێن زانا دگرن. **(ئەفلاتون)**

- ئەو ژنا قەشمەریێ ب زەلامان دکەت یا ژ هەژی هندێیە هەتا دمریت ب کچینی بمینتەڤە. **(پەندەکا چینییە)**

- نابیت کێماسیێن کەسێن دی ب تبلێن پیس بهێنە نیشان دان. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- دادوەری کرنا بلەزو بەز کو ئاریشەو رەهەندێن جودا جودا هەبن بەلگەیە ل سەر کێم عەقلی و شێتاتیێ. **(مونتین)**

- ئەو قازیێ بێ تاوانەکی سویچار دکەت وژدانا خۆ سویچبار دکەت. **(پەندەکا سویدییە)**

- ئەو کەسێ خۆ دکەتە قازیێ کەسێن دی خۆ سویچبار دکەت. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- ئەو کەسێ بچیتە دادگەهێ دێ پشیکا خۆ ئینیتەڤە لێ دێ گایێ خۆ ژ دەست دەتن. **(پەندەکا چینییە)**

- نەدویرە ئەو کەسێ تۆ ئەڤرو ترانا پێدکەی سبەهی پەسنا وی بکە. **(پەندەکا پورتوگالییە)**

- چێدبیت چێلا رەشبیت لێ شیرێ وێ یێ سپیبیت. **(پەندەکا روسییە)**

- مرۆڤێ مەزن بەس ژ رەخەکی ڤە دادوەریێ ناکەت. **(کنفوسیۆس)**

- مرۆڤ مافێ خۆ ب دۆڕینیت هەژیترە ژ سەرکەفتنەکێ ب نەحەقی. **(مونتسکیو)**

- پیڤەرێ (قیاس) زێڕی ئاگرەو پیڤەرێ مرۆڤا زێڕە. **(پەندەکا چینییە)**

- هەر شاشیەکێ بناسەکا هەی. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- دبارا هیچ کەسەکی دا داوەریێ نەکە هەتا خۆ نەدانییە جهێ وی. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- هەر دارەکێ رەهەکا هەی و هەر ناکۆکیەکێ بناسەك. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- کەس نەشێت بۆ کریارێن خۆ قازیەکێ دادپەروەربیت. **(پەندەکا ئینلگیزییە)**
- چ ژ دەڤێ تە دەربکەڤیت دێ ل سەر وی بناغەی دادوەریێ کەم. **(پەندەکا چینییە)**
- بەرێ خۆ نەدەرێ کاکی دبێژیت، بەرێ خۆ بدەرێ کا چ دبێژیت. **(عەلی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- قازیێ بەرتیل خۆر بەری مرنێ دێ شێت بیت. **(پەندەکا ژاپۆنییە)**
- ئەوێ راستیێ دبیژێت کولاڤ ل سەر سەری دپەشیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- زلکی د چاڤێ خەلکیدا دبینی، لێ گێسنی د چاڤێ خۆدا نابینی. **(پەندەکا کوردییە)**

# دادپەروەری

- ئەگەر ئەم خودانێ دلەکێ دلۆڤان نەبین، نکارین دادپەروەربین. **(دوو نارك)**
- مەزنترین ئێشا جڤاکا مرۆڤایەتیێ نەبوونا دادپەروەریێ یە. **(؟)**
- نەبوونا دادپەروەریێ دێ خودان شیان ترین کەسێ سەر عەردی دووچارێ لادانێ کەتن. **(سالیسبۆری)**
- چاخێ هەڤرکیێ خەسلەتێ دادپەروەریێ بکە پیشە. **(؟)**
- دادپەروەری بێ هۆشمەندی کارەکێ مەحالە. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- چاخێ بەرتیل ژ دەرگەهەی دهێتە ژۆرڤە، دادپەروەری ژ پەنجەرێ دچیتە دەرێ. **(پەندەکا تورکییە)**
- کاملترین تەرزێ نەدادپەروەریێ ئەوە کو دادپەروەر بهێینە پێش چاڤ، لێ دادپەروەر نەبین. **(ئەفلاتۆن)**
- دلێ مرۆڤی ب سروشتێ خۆ یێ دادپەروەرە. **(پەندەکا چینییە)**
- دکرنا دادپەروەریێ دا چاڤەرێی پاداشتی کرن دیما پلا نەدادپەروەریێ یە. **(سیسرۆن)**
- ب تنێ دادپەروەریە دبیتە سەدەمێ بەختەوەریێ. **(ئەفلاتون)**
- کەسێ خودان وژدان بیت ئەگەر یێ بێ مال و سامان ژی بیت هەر جهێ رێزا خەلکییە. **(؟)**
- دادپەروەری بنەکۆکا هەمی پێشڤەچوونەکێیە وە ستەم بناغێ هەمی ڤەمانەکێیە. **(ج. پ)**

# دوژمن

- ئەو کەسێ دۆست و دوژمن نەبن، بەلگەیە ل سەر هندێ کو کەسـەکێ بـێ هۆنەرو هێزە. **(لاڤاتر)**
- ئەو کەسێ ژ هەبوونا دوژمنا بترسیت وی چ جارا دۆسـتێن دروست نـابن. **(هزلت)**
- ئەگەر تـە دوژمنـەك هـەبوو دلتـەنگ نەبـە، چونکی ئـەوێ دوژمـن نـەبن مرۆڤەکێ بێ رێزو بهایە. **(قابۆسنامە)**
- ئەگەر تە ڤییا نەپەنیەکا خۆ ل دوژمنا ڤەشێری بۆ دۆستێن خـۆ نەبێـژە. **(فرانکلین)**
- ئەگـەر تـۆ نـەکاری دۆسـتا بـۆ خـۆ پەیـدا کـەی، دوژمنـا بـۆ خـۆ چێنەکە. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- دگەل هەمی کەسا دۆستایەتیێ نەکە، چونکی تـو نکاری دگـەل هـەمیا یـێ راستگۆبی. **(بیتاگرای)**
- دگەل دۆستێن خۆ یێ باشبە دا پتر حەژتە بکەن، وە دگـەل دوژمنـێن خـۆ باشیێ بکە دا ببنە دۆستێن تە. **(؟)**
- بەری هەمی دوژمنا یێ هۆشیاری دوژمـنێ خـۆ یـێ نێزیـك بـە کـو زمانـە. **(سوقرات)**
- ب ئاگرێ دوژمنکاریێ کەس نە سۆژینە **(پەندەکا چینییە)**
- پێکـۆلێ بکـە دۆسـتا پەیداکـە، چـونکی دوژمـن دەم و دەسـت یـێن هـەی. **(پەندەکا تورکییە)**
- ئەگەر تە پێنجی دۆسـت هـەبن کێمـە، لـێ تـە ئێـك دوژمـن هـەبیت زۆرە. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- مـرۆڤ دكاريـت دۆسـتا بكەتـە دوژمـن، لـێ زەحمەتـە مـرۆڤ دوژمنـا بكەتـە دۆست. **(قابۆسنامە)**
- دۆسـتێ تـە كەسـەكە كـو هـەر گاڤـا پەيڤـەكا حـەق ژتـە گوهلێبـوو تـوڕە نەبيت. **(فيساغورس)**
- ئازاردانا دلێ دۆستا حاسلكرنا مرادا دوژمنايە. **(سەعدی شيرازی)**
- ئەو دۆسـتێ مفـای نەگەهينتەتـە، ببيتـە دوژمـن ژی زيـانێ ناگەهينتەتـە. **(كەی قوباد)**
- دۆستا هند ب هێز نەئێخە كو بكارن دوژمناياتە بكەن. **(سەعدی شيرازی)**
- كاريگـەرترين چـەك بـۆ شـكاندنا دوژمـنی بـێن فرەهييـە. **(پەنـدەكا ئينگليزييە)**
- عاقل پەندا ژ دوژمنی وەردگريت. **(پەندەكا يۆنانييە)**
- كێماسيا دوژمنا زويتر ديار دبيت ژ باشيا دۆستا. **(پەندەكا سويديیە)**
- غەريب د دونيايێ دا كەسەكە كو دۆست نەبن. **(بۆزەرجمهور)**
- ئەو مفايێ مرۆڤێ عاقل ژ دوژمنێن خۆ وەردگريـت پـتره ژ وی مفـای يـێ مرۆڤێ نەزان ژ دۆستێن خۆ وەردگريت. **(ئەبو موسلمێ خوراسانی)**
- ئەو كەسێ هەڤكيفێ تە نەبيت نەكەرە دۆستێ خۆ. **(كنفوسيوس)**
- عيناد ب نەپەنی نامينتەڤە. **(شكسپير)**
- مەزنترين دوژمن نەزانينە. **(؟)**
- هەر گاڤا ب قەر پارا بدەيەڤ دۆستێ خۆ يان دێ دۆستێ خـۆ ژ دەسـت دەی يان پارێ خۆ. **(؟)**
- دوژمنێ زانا ژ دۆستێ نەزان باشترە. **(پەندەكا فارسييە)**
- دوژمنێ ئەڤرو سبەهی دێ ب تە ڤەدەت. **(پەندەكا چينييە)**
- دوژمن دگەل دوژمنی هەڤدگرن. **(پەندەكا ئسكۆتلەنديیە)**

- ئەوێ گورگی خودان دکەت بڕاستی دوژمنی ب هێز دئێخیت. **(پەندەکا دانیمارکییە)**
- ئەو کەسێ دلێ تە وی ب دوژمن دزانیت خۆ ژێ بپارێزە. **(سوقرات)**
- دوژمنێن خۆ بکەنە دۆست، ژ بەرکو ئەو ب ساناهی دکارن کیمیاسییێن هەوە بژمێرن. **(فرانکلین)**
- وەسا دۆستایەتیا هەڤالێن خۆ بکە کو ئەگەر رۆژەکێ بۆنە دوژمنێن تە زیانێ نەگەهیننەتە، هەروەسا وەتوڤ دگەل دوژمنێن خۆ سەرەدەریێ بکە، ئەگەر رۆژەکێ ژ رۆژان بۆنە دۆستێن تە عینادێ ل تە هەلنەگرن. **(عەلی کوڕی ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەگەر تۆ یێ کەفتی ژی بی خۆ ب هێز نیشا دوژمنی بدە. **(قابۆسنامە)**
- چ دۆستینی ژ وێ نەخۆشتر نییە. یا بۆ مەرەم و مەبەستەکێ تایبەتی دهێتەکرن. **(ئەبو حەسەن)**
- خەلك دۆستێ کەسایەتیا مە نییە، دۆستێ بەختەوەریا مەیە. **(ناپلیۆن)**

# درەوو

- مالا درەووینی سۆت کەس ژێ باوەر نەکر. **(پەندەکا کوردییە)**
- درەوو دبشکڤیت لێ بشکۆژ پێڤە ناهێن. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- ژیێ درەووێ یێ کورتە. **(پەندەکا کوردییە)**
- درەووکەر هەر گاڤ زۆر سویندا دخۆت. **(کودین)**
- درەوو درەووێ پنی ناکەت. **(پەندەکا کوردییە)**
- دنـاڤ ئاڤـا مـرارا درەووێ دا بـەس ماسـیێن مـری نـەبن کەسـێ دی تێـدا مەلەیێ ناکەتن. **(پەندەکا رۆسییە)**
- درەوو مینا بەفرێ یە چقاس دەستڤەدەن دێ مەزنتر لێهێت. **(لوتەر)**
- درەوو غارددەت دا نەکەڤیتە دەستێ راستیێ. **(پەندەکا شیلییە)**
- بتنێ سکێ راستیێ ل هەمی جهەکی بهایێ خۆ هەیە. **(پەندەکا چینییە)**
- بەرێ رۆژێ ب بێژینگێ ناهێتە گرتن. **(پەندەکا کوردییە)**
- قەسا راست و دروست بێژە بلا یا تەحل بیت. **(؟)**
- راستی رێکا خودێیە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەگـەر درەوو ئاریشـەکێ چارەسـەرکەت سـەد ئاریشـا دێ چـێکەتن. **(حیجازی)**
- درەووا هەژارە هەمی کەس دشێنێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- هۆش دارەکە فێقیێ وێ راستییە. **(ئەبو عەلا)**

- چ میراتەك وەكی راستی و دروستییێ یێ بهاگران نییە. **(شكسبیر)**
- ئەگـەر درەووینـەك بخازیـت خـەلك ژ درەووا وی بـاوەر بكـەت پێدڤییـە هزار درەووێن دی بكەت. **(پەندەكا ئینگلیزییە)**
- خودانێ درەووێ هەمی گاڤا یێ شەرمەزارە. **(پەندەكا كوردییە)**
- هەر كەسێ دگۆتنا خۆدا یـێ راسـت بێـژ بیـت دێ ل پـێش چاڤێن خـەلكی مەزن بیت. **(عەلی كوڕێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- دەستێن رەش ب رەنگێن سپی دهێنە نخافتن. **(پەندەكا ئەسپانییە)**
- یێ باش بەهدینە ئەو ژی دزەو حیزەو درەووینە. **(پەندەكا كوردییە)**
- درەوو وەكی دربا شیرییە ئەگەر ب برینێ بكەڤیت، دێ شوێنا وێ هـەر لـێ مینیت. **(سەعدی شیرازی)**
- سۆز شكاندن تایەكە ژ تایێن درەووێ. **(؟)**
- ئەو نۆژدارێ پەسنا خۆ (مدح) دكەت چ جـارا دەرمـانێ بـاش ل دەڤ نییـە. **(پەندەكا چینییە)**
- ئــەو مریــێ ب شــەڤ دمریــت ب رۆژ دێ هــەر ئاشــكرا بیــت. **(پەنــدەكا كوردییە)**

# راستی

- ئەو جهێ راستی لێنەبیت جهەکێ هەڕمی و پەستە. **(سوقرات)**
- ئـەو کەسـێ پویتـەی بڕاسـتیێ دکـەت دگـەل هـەڤتۆخمێ خـۆیێ دلۆڤانـە. **(مهاڤیرا)**
- تۆ یێ چاوانی وەسا خۆ دەربێخە. **(نیچە)**
- ئەوا تەهەی دێ چێتر تە دەتە نیاسین ژ وێ یا تۆ دبێژی. **(ئەمریسۆن)**
- د رێکا راستیێ دا روویێ خۆ وەرنەگێڕە. **(؟)**
- ئەوێ راستیێ دبێژیت کولاڤ ل سەری دپەشیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- دویر هەڕە راست و دروست وەرە. **(پەندەکا کوردییە)**
- مرۆڤایەتی یا پێدڤی راستییێیە. **(پایگۆن)**
- نابیـت مـرۆڤ چ تشـتەکی وەکـو راسـتی پەسـەند بکـەت مەگـەر هنگـی کـو مسۆگەر بزانیت ئەو تشت راستە. **(دکارت)**
- مرۆڤ چ دەما مینا هنگی گولی ناکەتە خۆ چاخێ هزر دکەت کەسێن دی یێن خاپاندنی و سەردابری. **(لارشفۆکۆ)**
- دەستپێکێ بزانە تۆیێ راستی یان نە، پاشی بۆ پێشڤە هەڕە. **(؟)**
- دەمێ بهاگرانە، لێ راستی ژ دەمی بهاگرانترە. **(دیزرائیلی)**
- چاخێ ئەرسـتۆی رەخنـە ل فەلسـەفا ئـەفلاتونێ گرتـی گۆتنـە وی چـماتە رێزا فێرکەرێ خۆ نەگرت، بەرسف داڤەو گـوت ئـەز حـەژ فێرکـەرێ خـود کەم لێ پتر حەژ راستیێ دکەم. **(ئەرستۆ)**
- باشترین سیاسەت راستی بێژییە. **(سرڤانتس)**

- ئەو باشیا ژ هەمیا پتر من دڤێت راستی یەو ستەم نەكرن. **(گاندی)**
- چونكی ئەزێ راستم ژ گەفا ناترسم. **(سۆفۆكل)**
- مادەم تە راستی نیاسی ل دیڤ هەڕە. **(حیكمەت چین هندو)**
- چرایێ راستیێ نەڤەمریایە هەر كەسێ پفكەتێ رهێن خۆدێ سۆژیت. **(غولام محسن زولفەقاری)**
- حەژ راستیێ بكە، لێ ل شاشیێ ببۆرە. **(ڤۆلتەر)**
- گوتنا راست یا تەحلە. **(پەندەكا كوردییە)**
- راستیا تەحل ژ درەووەكا شرین باشترە. **(پەندەكا ئەفریقییە)**
- راستیێ و گولاسۆر هەمی دەما كەلەمێن هەی. **(پەندەكا ئەسپانییە)**
- راستی یا گرانە، لەوما كێم كەس د بەرهەڤن وێ هەلبگرن. **(؟)**
- وەكی رۆژێ بۆ هەمیا مینا ئێكبە. **(بایەزید)**
- ستەم راستیێ پێپەست دكەت. **(پەندەكا فارسییە)**
- سەرێ من بشكێنە بەس راستیێ بێژە. **(پەندەكا یۆنانییە)**
- ئەو كەسێ بەس راستیێ دبێژیت پێدڤییە وی هەسپەكێ بەزێ هەبیت. **(پەندەكا ئیرانییە)**
- كوشنتدەتر ژ ژەهرا ماری ماف نەنیاسینە. **(شكسبیر)**
- هەر گاڤا د گۆشەكا عەردی دا ب نەحەقی خوین بهێتە رێتن، هەمی خەلكێ جیهانێ دەستێ وان ب وێ خوینێ یێ سۆرە. **(داستایۆڤسكی)**
- هەر گاڤ راستیێ بێژەو ئەهریمەنی شەرمەزار بكە. **(شكسبیر)**
- هەمی كەسا شیانا گوهلێبینا راستییێ نییە. **(تەوفیق حەكیم)**
- ئەوێن جڤین و ڤەسێن كرێت دبێژن دسەلمینن كو وان راستی ڤێنییە. **(رۆسۆ)**

- هیچ راستییەکێ د دونیایێ دا هەبوون نییە ئەگەر هێز دگەل دانەبیت. **(ناپلیۆن)**

- هیچ تشتەك یێ جوان نییە راستی نەبیت. **(بۆئالۆ)**

- یان وە بکە وەکی تو هەی، یان وەکی تو هەی یێ وەسابە. **(بایەزید بەستامی)**

- هەمی گاڤێ مرۆڤێ زمان لویس یێ حەق نییە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- حەقیێ دبن نەحەقیێ ڤە ترەترە. **(پەندەکا کوردییە)**

- ب جانەکێ ئازادو بێ دەمارگیری (تعصب)و بێ لایەنی لدیڤ راستیێ بگەڕیێن. **(دیکارت)**

# جحێلی و لاوینی

- ئەگەر زەلامەك زۆرێ پشت خارو پیر بیت ژنا وی یا تاوانبارە و بناسێن ژنا وینە. **(پەندەكا رۆسییە)**
- ئەگەر گەنجا زانین و پیرا هێز هەبا هەمی تشتەك دا جێبەجێ بیت. **(پەندەكا ئیتالییە)**
- مرۆڤ دكاریت ب زێڕی زۆر كارا ئەنجام بدەت، لێ نكاریت جحێلینیێ بكڕیت. **(رایموند)**
- دل تەڕی یا ب پیری و جحێلیێ نییە. **(پەندەكا كوردییە)**
- مخابن و حەیف كو گەنج نزانیت و پیر نەشێت. **(حیجازی)**
- خۆشی و نەخۆشیێن رۆژێن پیریێ بەرهەمێ كارێن بەری هنگی نە. **(بنت بۆد)**
- باشترین كار ئەوە ل گەنجیاتیێ فێرببی و ل پیراتیێ بكاربینی. **(بۆزە رجمهور)**
- ئەو دارێن تە ل لاوینیێ خرڤەكری ب پیراتیێ دێ تە گەرم كەن. **(پەندەكا ئەفریقییە)**
- پیری خەستەخانەكە جهێ هەمی نەساخیا د ناڤ خۆدا ڤەدكەت. **(پەندەكا ئەلمانییە)**
- بۆ شەڤا پیراتیێ دڤێت ل رۆژا لاوینیێ چرایەك بهێتە بەرهەڤكرن و هەلكرن. **(بلۆتارك)**
- لاوینی بهارا حەزایە. **(دیكنز)**
- لاوینی سندوقەكا قەپاتە بەس پیر دزانن چ دنیڤەكا وێدا هەیە. **(؟)**

- لاوینی گریەکە داڤا زارۆکینییێ و پیراتییێ پێکڤە گرێددەت. **(دۆکلوس)**
- لاوینی ستێرەکە بەس جارەکی ل ئەسمانێ ژی (عمر)دا دهەلێت. **(ژوبرت)**
- ل قویناغا لاوینییێ دا دلینی ب سەر عەقل و هۆشێدا یێ زالە، لێ ل قویناغا پیراتییێ دا عەقل ب سەر دلینییێ دا یێ زالە. **(ژ پەرتووکا خوداوەندێ مرنێ)**
- بڕاستی لاوێن پیرو پیرێن لاوو د دونیاییێ دا زۆرن. **(ئیسمایلز)**
- ئەوێ ل لاوینییێ وان تشتا دکڕیت یێن نە پێدڤی، دڤێت ل چاخێ پیرییێ دا هەمان ئەو تشتێن کو پێدڤی پێ هەی بفرۆشیت. **(لورد ئاڤیبوری)**
- هەمی کەس حەز دکەن ژیێ وانێ درێژ بیت لێ کەس حەز ناکەت پیر ببیت. **(سویفت)**
- هەر ئێك ل دوی دلێ خۆ یێ پیرە. **(؟)**
- پیری یا ب گوری و گەڕە. **(پەندەکا کوردییە)**
- تاوانێن چاخێ لاوینییێ دێ ل سەر روویمەتێ پیراتییێ هێنە ڤەخاندن. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- لاوینی تڤاڤکەرا زارۆکینییێ یە. **(شاوو)**

# رەوشت و سنج (اخلاق)

- رەوشت سامانێ مەیە، رەوشت باشترین و چێترین دراڤێ مەیە. **(ئیسمایلز)**
- رەوشتێ باش ب تەخەکێ ڤە یێ گرێدای نییە، دناڤ هەر تەخ و کومەکێ دا پەیدا ببیت ژ هەژی رێز لێگرتنێیە. **(ئیسمایلز)**
- رەوشت تشتەکێ چێکری و بەرهەڤ و ئامادە نییە، بەلکی کێم کێمەو هێدی هێدی پەیدا دبیت. **(ئارنالیال)**
- رەوشتێ باش مینا جۆکا ئاڤێ یە. زەڤی و عەردێ بەیار ب بەرهەم و بەرووبوومێ خۆ شیندکەت. **(لائوتسێ فەیلەسوفێ چینی)**
- رەوشت دکاریت جهێ زانستی و سامانی و هەمی تشتەکێ جوان و کەشخە ڤەگریت، لێ چ نیعمەت جهێ وێ ڤەناگرن. **(حیجازی)**
- هەمی گاڤا رەوشت پویچی دەستپێکا ژ ناڤچوونا شارستانیەتایە. **(کازم زادە ایران)**
- مرۆڤێ رەوشت خراپ عەبدالێ دەستێ دوژمنی یە ب چیتە کیرێ ژ دەستێ وی قورتال نابیت. **(سەعدی)**
- رەوشت ژ قانونێ بلندترە، چونکی قانون هەمی گاڤا دگەل مرۆڤی نییە، بەلێ رەوشت هەمی گاڤا یێ دگەل مرۆڤی دا. **(ئیسمایلز)**
- ب خۆ پاراستنێ و باشیێ ئەم دێ کارین بەختەوەریێ بکڕین. **(؟)**
- تەڤایا مللەتێن جیهانێ گاڤا دووچارێ رەوشت خراپیێ بوون دێ بەرەڤ نەمانێ چن. **(؟)**
- باشترین میرات کو باب بۆ زارۆکێن خو پاشی خۆ ب جه دهێلن پەروەردەکرنا باشە. **(سیسرون)**

# کڕی و بێ دەنگی

- ئەگەر ئاخفتن زیڤ بیت نە ئاخفتن زێڕە **(پەندەکا کوردییە)**
- فێقیێ ئارامیێ ب دارا بێ دەنگیێ ڤە دهێت. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- ئەگەر تە لبەرە یێ عاقل بی دانیشەو گوهبدێرە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- مـرۆڤ دڤێـت کـێم دگـەل خـەلکی و زۆر دگـەل خـۆ باخڤیـت. **(پەنـدەکا دانیمارکییە)**
- بێ دەنگی جوانیا زانایەو داپۆشینا نەزانییە. **(؟)**
- دەرمانێ تورەبوونێ بێ دەنگییە. **(سوقرات)**
- زمانێ مرۆڤی مارەکە کەلەخێ خۆ دگەزیت. **(گوگول)**
- ژنا لال چ جارا ب دەستێ زەلامێ خۆ نەهاتیە قوتان **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- بێ دەنگی هنگی دروستە چاخێ چ کورە ل سەر لێڤا چالێ نەبن. **(؟)**
- گوتنـا ددەمـێ خـۆداو بـێ دەنگیـا ددەمـێ خـۆدا نیشـانێ هۆشمەنـدیێ یـە. **(سوقرات)**
- بێ دەنگی پەیڤەکە یا بێ مەسرەفە. **(پەندەکا هندییە)**
- بێ دەنگی پەرجانە ل دۆر حیکمەت و زانینێ هاتیە راچاندن. **(؟)**
- بێ دەنگ چ جارا دووچارێ شاشیێ نابیت. **(پەندەکا هندییە)**
- گرێدانا زمانی گرانترین ئەرکە. **(وینە)**
- ئەوێ خۆ کڕ دکەت ژ مەترسیا یێ پاراستییە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- زەلامێن مەزن کێم دئاخڤن و زۆر تێدکۆشن. **(کنفوسیۆس)**
- بۆ نەزانی چ ژ بێ دەنگیێ باشتر نییە، ئەگەر زانیبا هۆسایە یێ نەزان نەدبوو. **(سەعدی شیرازی)**
- دەمێ هۆش زێدە دبیت گۆتن و ئاخڤتن کێم دبیت **(پەندەکا عەرەبییە)**
- هزار جارا گوهێ خۆ بدەرێ و ژ جارەکی پتر نە ئاخڤە. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- تۆ ئاغایێ وێ گۆتنێی ئەوا هێشتا تە نەگۆتی لێ دەمێ تە گۆت هنگی ئەو ئاغایێ تەیە. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- ئەگەر ژ بەر بێ دەنگیێ یێ پشێمان بی باشترە ژ بەر ئاخڤتنێ یێ پێشمان بیت. **(ژ جامع تەمسیل)**
- بتنێ بێ دەنگییە کو دکاریت مە بگەهیتە زانینێ. **(راماکریشیا)**
- ئەوێ بڤێت ببیتە ئاخڤتکەرەکێ باش دڤێت گوهدارەکێ باش بیت. **(ج. پ)**
- ژ ئەرستالس هاتە پرسین رەووانبێژی چییە؟ گۆتی کێم ئاخڤتن کو زیانێ نەگەهینتە رامانا (معنی) وێ. **(ئەرستالس)**
- ئەگەر هەمی کەس نەشێن گۆتنێن دلحەبین بکەن بلا خۆ بێ دەنگ بکەن، خۆ دکارن ڤێ بکەن. **(بوزەر جمهور)**
- ئاخڤتن دەرمانەکە کو کێم مفاو زۆر زیان هەبیت. **(عەلی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ رازی بیت**
- هەر گاڤا هوین ل دیوانەکێ بوون کو کەسێن ناسیارو نەنیاس تێدابوون گوهێ خۆ بدەنێ و کێم باخڤن، بێژەرێ شارەزا گوهدارەکێ شارەزایە. **(پەرتووکا ئایینێیێ کامیابی)**
- دەڤ پیا هەلدگریت. ئانکو ئەو رێکێ بۆ دەستنیشان دکەت. **(پەندەکا ئیتالییە)**

# کارو تەنبەلی

- ئەوێن کاری ب زانینا خۆ نەکەن وەکی وی نەساخینە یێ دەرمان هەبیت و بکار نەئینیت. **(زیمقراتیس)**
- ئەو کارێ باشە کو بارا پترا خۆشیێ بۆ بارا پترا خەلکی ب دەستڤەبینیت. **(فرانسیس هنچسون)**
- ب هەر کارەکیڤە خەریك بوون باشترە ژ تەنبەلی و بێ کاریێ. **(ئیسمایلز)**
- ئەگەر تەبڤێت ب گۆتنا کار بکەی ب گۆتنا خۆ کار بکە. **(؟)**
- شۆلکەرێ خۆبە خۆشتڤیێ خەلکی بە. **(پەندەکا کوردییە)**
- هەتا بەرێ دەستی رەش نەبیت تاما زاری خۆش نابیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- دەستێ ماندی ل سەر زکێ تێرە. **(پەندەکا کوردییە)**
- مرۆڤ زارۆکێ کارو بزاڤا خۆیە. **(دارۆین)**
- ل هیڤیا خەلکی خۆلیا شکەلکی **(پەندەکا کوردییە)**
- مرۆڤ ب سەر هەستێن خۆدا یێ زال نییە، لێ ب سەر کریارێن خۆدا یێ زالە. **(لۆگۆڤە)**
- مرۆڤ دکارێ خەلکی دا عاقلترە ژ کاری خۆ. **(لاروشفوگۆلا)**
- نانێ خۆ بخۆ بئاڤێ منەتا خەلکی پاڤێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- عەورێ ڤرڤرێ یێ بێ بارانە. **(پەندەکا ئیرانییە)**

- هەمی عەورا باران ژێ نابارێت. **(پەندەکا کوردییە)**
- مرۆڤێ ئەحمەق مایێ خۆ دکارێ هەمی کەساندا دکەت بەس دکارێ خۆدا نەبیت. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- ئەگەر بزانی دێ سبەهی چ قەومیت ئەڤرو کار ناکەی. **(پەندەکا چینییە)**
- ئەگەر نەکاری لەڤا پاڤێژی ددانێن خۆ نیشان نەدە. **(پەندەکا ئیرانییە)**
- ئەی تەنبەل هەرە دەڤ مێریێ و تەرزو شێوازێ کارکرنێ ژێ فێر ببەو عاقل ببە. **(؟)**
- بەدبەختیا مرۆڤی ژبەر نەزانینێ نییە ژبەر تەنبەلیێیە. **(دیل کارەنگی)**
- پێدڤییە بۆ شەڤا پیراتیێ ل رۆژا گەنجاتیێ چرایەکی بەرهەڤبکەین و هەلکەین. **(؟)**
- قەت ب خۆزیا ناگەهییە قەبدێن کەزییا. **(پەندەکا کوردییە)**
- باشترین ڤیتامین کو تەنبەلا پێدڤی پێ هەی کارکرنە. **(؟)**
- هەتا پشکەك ژ کاری مایە دڤێت وە هزر بکەی تە چ نەکریە. **(؟)**
- بابێ من ئەز فێری کاری کرم، ڤیان و حەژێکرنا کاری نیشا من نەدا. **(لینکلن)**
- چال ب شەونمێ ناهێتە تەژیکرن. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- د دوونیایێ دا کەسەك نییە کو یێ ژ هەژی چ کارا نەبیت. **(خواجە نیزام مالك)**
- دوهی ژ بیر بکە، ئەڤرو کار بکە، ب سبەهی یێ ئومێدواربە. **(پەرتووکا کاروزیندگی)**
- ژیانا بێ کاروکریار مرنەکا بەروەختە. **(گوتە)**
- خەوا ل سەر تەختێ نەرم یا گرانە. **(پەندەکا روسییە)**
- دونیا یا دلەپێ وان کەسادا ئەوێن خودان شیان و هێز. **(ناپلیۆن)**

- د هۆنەرەکیدا شارەزایی پەیداکرن باشترە ژ هندێ کو مایێ خۆ دسەد شولان بکەی و چ ژوان نەزانی. **(پەندەکا ژاپۆنییە)**
- سەرۆکانیا هەمی خراپیەکێ بێ کارییە، ئەهەریمەن بۆ مرۆڤێ بێ کار شۆلێ پەیدا دکەت. **(پاسکال)**
- سە دڕەویت و کاروان هەر ل رێکا خۆڕا دچیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- بناسا هەر غەم و کۆڤانەکێ بێ کارییە. **(پۆرتن)**
- ژیێ (عمر) مرۆڤی سندوقەکە مرۆڤ دکاریت هەم ب هزرو کارێن باش تەژی بکەتەڤە هەم ب هزرو کارێن خراپ تەژی بکەتەڤە. **(ئەرستۆ)**
- بتنێ دارا ساخلەم بەر پێڤەدهێت. **(پەندەکا چینییە)**
- کارێ بچیك بکە، لێ بۆ کارێ مەزن خۆ بەرهەڤبکە. **(؟)**
- کار نۆژدارێ سروشتییە و ژ بۆ بەختەوەریا مرۆڤی یێ پێدڤییە. **(جالینۆس)**
- کار داسا دەمی (وقت)یە. **(ناپلیۆن)**
- دەنگێ کریارێ ژ دەنگێ گوتارێ خۆشترە. **(کارولین ولتەر)**
- ئەو کەسێ ل بەراهیکا کاری هزر نەکەتەڤە ل دیماهیکا کاری دێ ئاخ و نالینا هەلکێشیت. **(پەندەکا ئیتالییە)**
- ئەو کەسێ لبەر هتاڤێ زەحمەت کێشای حەقە ل بەر سبەرێ بێهنا خۆ ڤەدەت. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- کو تە پێلاڤێ مەزن کرە پیێ خۆ نەکەڤی! **(پەندەکا چینییە)**
- گۆتنا شرین و کریارا تەحل زۆرێن سەردابری. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- خەلك هەمی ژ ماکەکێ نە باش و خراپیا وان ژ ئەنجامێ بزاڤ و کریارێن وانایە. **(ئیسمایلز)**
- مێشکێ تەنبەل کارگەها هەریمەنی (شەیتان)یە. **(فرانکلین)**

- مەلەڤان دناڤ دەریایا تۆفانی دا دهێتە نیاسین. **(پەندەکا یوگسلافییە)**
- چ گاڤا شولێن مەزن ب مرۆڤێن کچکە ناهێنە کرن. **(سیدرون)**
- بۆ کرنا هەر کارەکی ئەگەر تە بڕیاردا هەروەکی تەنیڤەکا وی کاری ئەنجام دای. **(ئیبراهیم لینکلین)**
- هەر کارەکێ مەزن ل بەراهیکێ ب تشتەکێ مەحال (مستحیل) دهێتە بەرچاڤ. **(کارلایل)**
- ل هەر جهەکێ تۆ لێبی ب کارەکیڤە خۆ مژیل بکە. **(هانری فەرد)**
- دەلیڤە شیرە ئەگەر نەبڕی دێ تە بڕیت. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- قویناغا هزار میلان ب گاڤەکێ دەست پێدبیت. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- چقاس تەماسی پتر بڤێن هندقاس دڤیا خۆل دەریایێ نێزیك بکەیەڤە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- هەمی دباشن لێ نەبوو هەمی شولا. **(پەندەکا ئەسپانییە)**
- هەرگاڤا برا ب هەڤڕا کار بکەن چیا دێ بیتە زێڕ. **(؟)**
- کارەکێ باش چێدبیت کەسەکی یان گوندەکی یان باژێڕەکی یان مللەتەکی رزگار بکەت و پێشڤەببەت. **(گوتە)**
- رۆژەکا بێ کارییێ وەکی شەڤەکا نەڕازانێ یا ب ماندیبوونە. **(پتی سن)**
- کەسەك نەشێت دۆ بەلەما ب هەڤڕا لێبخۆڕیت. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- هزار گۆتن قوربانی کریارەکێ بن. **(پەندەکا کوردییە)**
- مستەکا کاری ژ بادمانەکا سۆزا (عهد) باشترە. **(پەندەکا یۆنانییە)**

# گەل - نیشتمان

- پارێزڤان و زێرەڤانێ ئازادیا هەر مللەتەکی زیرەکی وقەهرەمانیا وییە. **(شێخ محمد خیابانی)**

- ئەگەر ئەز سەرپشك کربامەو گۆتبانە من ل وەلاتێ مە حکومەت یا بێ رۆژنامە بیت یان رۆژنامەیا بێ حکومەت بیت، بێ گۆمان ئەز دا یا دوویێ هەلبژێرم. **(جفرسن)**

- بەر ل جهێ خۆیێ ب سەنگە. **(پەندەکا کوردی)**

- ئازادی یا پێدڤی دادپەروەریێ یە ئەم هەمی د هەمبەر یاسایدا ئێکسانین. **(شێخ محمد خیابانی)**

- ئەگەر ل مشەختیێ زێڕ ببارن، ل نیشتمانی بەر ببارن باشتر ل نیشتمانێ خۆ بمینیەڤە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**

- ئەگەر تەلبەرە بزانی کا چقاس تۆ حەژ نیشتمانێ خۆ دکەی دەمەکی هەڕە دەرڤەی وەلاتی. **(پەندەکا رۆمییە)**

- بۆ هندێ نیشتمان پەیدا ببیت خوێندنگەهەك و گۆڕستانەك بەسن. **(موریس باریس)**

- چقاس کارەکێ سەختە مرۆڤ بمریت و چ خزمەت پێشکەشی وەلاتێ خۆ نەکربیت. **(لینکلن)**

- دناڤ خویندگەهێدا پێدڤییە مرۆڤ نیشتمانێ خۆ بنیاسیت. **(میشلە)**

- ئەو مللەتێ ل سەر قوربانی دانێ ڕاهاتبیت دکاریت بەرەڤ پلێن بلند ژێهەل بچیت. **(گاندی)**

- ئەو گەلێ مافێ گەلەکێ دی پێپەست دکەت چ جارا ژ نازو نیعمەتا ئازادیێ یێ بەهرەمەند نییە. **(پروشینسکی)**

- بزمار دكاريت نالەكێ رزگار بكەت، نالەك دكاريت هەسپەكی رزگار بكەت، هەسپەك دكاريت سيارەكی رزگار بكەت، سيارەك دكاريت وەلاتەكی رزگار بكەت. **(پەندەكا توركييە)**

- چێلەك گاڕانەكێ تەڕوو دكەت. **(پەندەكا كوردييە)**

- گەدايەك بۆ ئاڤڕووی برنا مللەتەكی بەسە. **(پەندەكا يۆنانييە)**

- هێزا هەر وەلاتەكی نەيا گرێدايە ب پاپۆڕو چەپەرو سەنگەرێن وێڤە يا گرێدايە ب زەلامێن وێڤە. **(ليئوتوليستوو)**

- ئالۆزی و پەرێشانی هەر گاڤ دناڤ حكومەتێن ديكتاتۆردا سەرهەلددەن. **(ناپليۆن)**

- كيش مللەت ژ هەميا بەختەوەرترە؟ ئەو مللەتێ خودان ياسا بيتن، ژوی مللەتی بەختەوەرتر؟ ئەو مللەتە يێ ب ياسايێن خۆ كاردكەت، ژوی مللەتی بەختەوەرتر، ئەو مللەتە كو دناڤ ياسايێن ويدا جوداهی نەبيت، ژوی مللەتی ژی بەختەوەرتر؟ ئەو مللەتە كو هيچ پێويستی ب قانونێ نەبيت. **(ژ پەرتووكا پرپر)**

# کەسێن مەزن و بلیمەت

- ئەو تشتێ مرۆڤی مەزن  دکەت سەرکەفتنە. **(ناپلیۆن)**
- دگەلْ زانایان ڕابە و ڕووینە و ژ گولستانا زانستێ وان پەیڤێن جوان بچنە. **(؟)**
- رۆژێن تەنگاڤیێ زەلامێن مەزن چێدکەن . **(کەنەدی)**
- مرۆڤێ  مەزن ئەگەر ببیتە پرە ژی ل سەر ڕانە چە. **(پەندەکا کوردییە)**
- بۆهندێ یێ مەزن بی بەراهیکێ یێ کچکەبە. **(پەندەکا هندییە)**
- بۆکەمالا مرۆڤی سەدسال هێشتاکێمن، لێ بۆ بەدناڤیێ رۆژەك بتنێ بەسە. **(پەندەکا چینییە)**
- چێکرنا ناڤەکێ مەزن ب ساناهیترە ژ پاراستنا وی ناڤی. **(بۆئەفن)**
- مەزناتی نەیا ب حەسەب و نەسەبێ یە یاب تۆرەو زانینێ یە. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- خۆشکاندن پێپەلانکا مەزناتی وبلندبوونێیە. **(شکسبیر)**
- ئەوکەس چقاس یێ مەزنەئەوێ دانێ ب هەلەوشاشیاخۆ دادئینیت. **(پەندەکا ئنگلیزییە)**
- مرۆڤ دکاریت پلەوپایێ هەرکەسەکێ مەزن برێکا هژمارا دوژمنێن وی بزانیت. **(ناپلیۆن)**
- شکەستێن ژیانێ مرۆڤێن مەزنێن چێکری،نە سەرکەفتنێن وێ. **(؟)**
- دلسۆزی بەلگەیەکە ژ بەلگێن بلیمەتیێ. **(بۆدلەر)**
- هژمارەکا کێما مرۆڤێن مەزن بەسن کو مللەتەکی ب ناڤ ودەنگ بێخن. **(ناپلیۆن)**

- قەسرێن بلند ب سبەرا خۆ دهێنە نیاسین،مرۆڤێن مـەزن ژی ب دۆژمنـێن خۆ دهێنە نیاسین. **(پەندەکا چینییە)**
- مرۆڤێ مەزن یێ خودان ه یبەتە،لێ یێ دفن بلندنییە، مرۆڤـێ کچکە یـێ دفن بلندە لێ یێ بێ ساف وهەیبەتە. **(کنفوسیوس)**
- مرۆڤێن مەزن مینا بلوورانە دشەڤێن رەش وتاری دا خۆ دسۆژن داجیهانێ رۆناهی بکەن. **(ناپلیۆن)**
- مرۆڤـێ مـەزن درەنـگ سـۆزو پـەیمانێ ددەت،لـێ زوی سـۆزاخۆ ب جـە دئینیت. **(کنفوسیۆس)**
- ئاریشەو نەخۆشی بلیمـەتیێ دیاردکـەن وە تـەنایی و ئاسـۆدەیی بلیمـەتیێ ڤەدشێرن. **(هۆرس)**
- تێکهــەلی زانینــا مرۆڤــی زێدەدکــەت لــێ ب تــنێ ژیــن خۆیندنگــەها بلیمەتییێیە. **(گیبۆن)**
- فـەرە نـەهێلین کەسـێن ڕەسـەن و شـەریف بـەری وەرگرتنـاپلا شـانازی و سەرفرازیێ ژناڤا مەدەرکەڤن. **(فرانکلین)**
- چ جـارا ناگەهییـە پـلا بلنـدیێ هـەتا دوێ رێکـێ دا زحمـەتێ نەکێشـی. **(سیسرون)**
- مرۆڤێ مەزن کێماسیامرۆڤێ کچکە نابینیت. **(پەندەکا چینی)**
- مرۆڤێ مـەزن دگـەل خـۆیێ تۆنـدە، لـێ مرۆڤـێ بچیك دگـەل خـەلکی یـێ تۆندە. **(کنفوسیۆس)**
- مرۆڤـێ مـەزن ب روویمەتـەکێ خـۆش خـەلکێ ڤـەدزڤڕینیت، لـێ مرۆڤـێ کچکە ب روویمەتەکێ تەحل خەلکی وەردگریت. **(کنفوسیۆس)**
- هـەژیاتیا مرۆڤـێ مـەزن هنگـی دەردکـەڤیت دەمـێ دگـەل مـرۆڤێن کچکە رەفتارو سەرەدەریێ دکەت. **(کارلایل)**
- مرۆڤەکێ چاڤلێکەر نەبە، خۆ بنیاسە، تۆ چ تشتی ئـەو بـە، ژ بـەرکو دڤـێ دۆنیاییێ دا کەسێ وەکی تە نییە. **(دیل کارەنگی)**
- بۆ مرۆڤێ خودان شیان چ بار دگران نینە، وە بـۆ مرۆڤـێ بازرگـان چ رێـك دویرنینە،وە بۆ مرۆڤێ زانا چ وەلات بیانی نینە،وە بۆ مرۆڤێ زمان لویس چ کەس دوژمن نینە. **(پەندەکا چینییە)**

# ڤیان و حەژێکرن

- ئەوێ لبەر چاڤا نەبیت لبەر دلا نییە. **(پەندەکا کوردییە)**
- بۆ چێکرنا پەیوەندییێ دڤێت حەژێکرنا خۆ دیاربکەی. **(دیل کارەنگی)**
- هەمی ڤیانا خۆ نیشا دۆستێ خۆنەدە، چونکی ئەگەر گوهرینەکا کێم بەسەردا بهێت دێ تەب دوژمنێ خۆ ل قەلەم دەتن. **(سوقرات)**
- سەخمەراتی گولەکا سۆر باغەڤان دبیتە خولامێ هزار کەلەما. **(پەندەکا تورکییە)**
- نوی هاتن کەڤن خەلاتن. **(پەندەکا کوردییە)**
- یێ دلپاك بە دا دلا بکەیە پەلاتینکێن خۆ. **(کازم زادە)**
- ل چ جها دوژمن ب سەر حەژێکرنێ دا سەرناکەڤیت. **(سیدنی)**
- ب ڤیانێ مرۆڤ دکاریت دونیایێ بێخیتە بن دەستێ خۆ. **(؟)**
- دلێ مرۆڤا یێ کویڤییە ب سۆزو ڤیانێ کەهی دبیت. **(عەلی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- دل دلا دحەبینیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- تۆ چاوا ئامانێن خۆ پاقژ دکەی وەسا دلێ خۆژی پاقژ بکە. **(پەندەکا چینییە)**
- ب قەسا خۆش مار ژ کونێ دهێتە دەرێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- گەمیا ڤیانێ هەتا دکاریت ل چیا ژی سەردکەڤیت. **(؟)**
- دلۆڤانی زنجیرەکا زێڕینە ب خەلەکێن وێ ئەندامێن جڤاکێ پێکڤە دهێنە گرێدان. **(گوتە)**

- چ تشتەك مينا چاكيێ مرۆڤى تێر ناكەتن. **(ئەرستۆ)**
- ئـەو خـەلاتێ بهاگران و بـەلاش كـو چ جـارا نەهێتـە ژ بيركـرن دلۆڤـانى و ڤيانە. **(لاروونس)**
- پەيڤەكا حەژێكەر دكاريـت هـەمى وەرزێ زفسـتانا مرۆڤـى گەرمبكەتەڤـە. **(پەندەكا ژاپۆنييە)**
- بـەس چـەكێ ڤيـانێ و حـەژێكرنێ دكاريـت ئاشـتى و زەلالـەتێ بـۆ نفشـێن مرۆڤان دابين بكەتن. **(؟)**
- ڤيان و حەژێكرن مينا تۆڤێ گەنمييە پاش چاندنێ وەرارێ دكـەت و زێـدە دبيت. **(پەندەكا ئەفريقييە)**
- مـرۆڤ دڤێـت ڤيـانێ ژ ماسـيێ فێـر ببيـت كـو ژ ئـاڤێ دەربێخـى بمـريتن. **(پەندەكا ئيرانييە)**
- دەمێ تە دلێ خۆ كرە خەلات يێ هۆشياربە. **(پەندەكا ئەفريقييە)**
- سەرۆكانيا حەژێكرنا ژن و مێرا رێز ل هەڤگرتنە. **(فنلۆن)**
- دلێ تەژى ڤيان هەمى گاڤا يێ تەڕە. **(؟)**
- ژنا دلۆڤان هەتا مرنێ خودانێ زەلامێ خۆيە. **(بۆدس پارسترناك)**
- ژ ڤەستا ل هيڤيا ڤيانا كەسێن دى نەبە، دڤێت تۆ ڤيانێ دناڤ دلێ كەسێن ديدا چێكەى. **(حيجازى)**
- ئەو كەسێ سنۆرەكى بۆ ڤيانێ دادئينيت دبنيڕا وى رامانا ڤيانێ نە زانييە. **(پۆشكين)**
- ئەوێ تۆڤێ دلۆڤـانيێ بچينيت دێ بـەرێ مـاف ناسـيێ درويـت. **(پەنـدەكا عەرەبييە)**
- كليلا ڤەكرنا دەرێ هەمى ئاريشا ڤيانە. **(پەندەكا ئيرانييە)**
- جيهانا مە مينا كەڤرييە هەر كەس تێدا بـانگ هەلـدێريت دێ دەنگێ وى دەنگ ڤەدە تەڤە، ئەو كەسێ جانێ وى ژ سۆزو ڤيانێ يێ تەژى بيت ژبلـى ڤيانێ و وەفايێ تشتەكێ دى نابينيت. **(لورد ئاڤيبۆرى)**

# قومار

- لۆکەی ژ ئاگری دویر بێخن، گەنجا ژی ژ قومارێ. **(فرانکلین)**
- بەختەوەری هەروهەر ژ قومارێ درەڤیت. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- قومارکەر دێ چوار تشتێن خۆ ل دیڤ هەڤ ژ دەست دەتن پارەو دەم وژدان و ژیانا خۆ. **(پنیاکوو)**
- قومارکەر ئەڤیندارە نە چ جارا مرادا وی حاسل دبیت، نە چ جارا بێ هیڤی دبیت. **(حیجازی)**
- قومارکەر هەڤالێ دزیکەرییە. **(پەندەکا روسییە)**
- قومارکەر رۆژێن خۆ ب دۆژمنکاریێ دگەل دۆستێن خۆ دبەتە سەری. **(حیجازی)**
- ئەگەر تۆ بوویە قومارکەر دێ بییە بکوژ (قاتل) ژی. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- قومارکەرێ کورەیە لێ کەسێ تەنیشت دەستێ خۆ باش دبینیت. **(پەندەکا چینییە)**
- هەر کێماسییەك کێماسییەکا دی چێدکەت، لێ قومار دایکا هەمی کێماسیایە. **(حیجازی)**
- هەر گاڤا ل سەر مێزا قومارێ ڕاببی دەرفەتە. **(پەندەکا ئسکوتلەندییە)**
- قومارو شەڕاب و ژنا خراپ گرنژنیێ ل سەر لێڤێن زەلامی دویر دئێخن. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- قومار کوڕێ تەماعیێ و برایێ دلتەنگیێ و بابێ خراپییێیە. **(واشنتۆن)**

# قەناعەت

- مرۆڤێ دەست بەلاڤ (مصرف) ئەڤرو خاز خازوکێ سبەهییە. **(ئەبو عەلا)**
- ئەو کەسێ تشتێ نە پێدڤی دکڕیت دێ زوی نەچار بیتن کو تشتێن خۆ یێن فەر بفرۆشیت. **(پەندەکا یوگسلافییە)**
- بلا دناڤ دارستانێ دا بژی، لێ قەدرێ داری بزانە. **(پەندەکا چینییە)**
- ئەگەر تۆ ژ قەرداریێ بترسی دەرگەهێ مالا خۆ ڤەنەکە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- بۆ زەنگین بوونێ هەر زانینا رێکا پەیداکرنێ بەس نییە، بەلکی دڤێت رێکا مەزاختنێ ژی ب باشی بزانی. **(فرانکلین)**
- بۆ کەسەکی کو چ نەبیت قەرکرن ژی هەر رەنگە دزینەکە. **(رۆسۆ)**
- بۆ هندێ مرۆڤ بکاریت ب بەختەوەری بژیت، دڤێت چاڤپۆشیێ ل هندەك داخازێن خۆ بکەت. **(شامفور)**
- بۆ مرۆڤێ قانع بلا یێ هەژارو بەلەنگاز بیت هەر خۆشە، لێ بۆ مرۆڤێ بێ قەناعەت بلا یێ زەنگین و ناڤدار بیت هەر نەخۆشە. **(پەندەکا چینییە)**
- هەبوون یا ب قەناعەتێ یە نەیا ب کەلوپەلایە. **(سەعدی شیرازی)**
- هندێ شرین نەبە کو تەداعویرن، هندقاس یێ تەحل ژی نەبە کو تە پاڤێژن. **(زیمقراتیس)**
- شێتاتییە بۆ خاترا کەلوپەل و کەرەستێن جوانکرنێ. مرۆڤ خۆ دووچاری قەرداریێ بکەتن. **(فرانکلین)**

- کێم مەزاختن دێ مرۆڤێ هەژار کە تە خودان پارەوە دێ خودان پارەی کەتە عاقل. **(ئەلیکسەندەر دۆما)**

- مرۆڤ ب ئاخێ نەبیت تێر نابیت. **(پەندەکا کوردییە)**

- قەناعەت گەنجەکە چ جارا خەلاس نابیت. **(پەندەکا کوردییە)**

- ئەو کەسێ ب وی تشتێ هەی پێ رازی نەبیت، هەمی دونیایێ بدەنێ پێ رازی نابیت. **(سینکا)**

- ئەزێ محتاج نیمە، چونکی ئەزێ فێری رێکا قەناعەتێ بووی. **(بۆس)**

- هەر کەسێ هەژارو ب قەناعەت بیت پێ دەولەمەندە. **(شکسبیر)**

- نە هندێ گربە کو ژتە تێر ببن، نە هند ژی پێ نەرم بە کو ب سەر تەدا سەر بکەڤن. **(شکسبیر)**

- زێدەگاڤی کرن د مەزاختنێ دا سەرۆکانیا بەد بەختیێ. **(عەلی کوڕێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**

- چاخێ دەستێ مە نە گەهیشتە ئەو تشتی ئەم حەژێ دکەین، پێدڤییە حەژ وی تشتی بکەین پێ دەستی مە دگەهیتێ. **(بۆس رابووتن)**

- هەر چقاس تە کێمتر هەبیت بارێ تە سڤکترە. **(پلۆتارك)**

- ئەو تشتێ ل مرۆڤی دهێتە قەدەغەکرن دبیتە مەرەق. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- قایدەو مام ناڤنجیەتی کەمالا سرۆشتێ مرۆڤییە. **(کنفۆسیۆس)**

بارێ سێ کەسا پێ گرانە مرۆڤێ بێ قەناعەت و مرۆڤێ حەسویدو مرۆڤێ چاڤبرسی. (؟)

# قایدەیی ومام ناڤنجی بوون

- هەرکەسێ وازێ ل مام ناڤنجی بوونێ بئینیت یێ سەرگەردانە. **(علی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەوتشتێ بارێ ژیانێ ل سەر ملێن مە گران دکەت بارا پتر زێدەگاڤی کرنە دژیانێ دا. **(رۆسو)**
- هێدی هەڕەو هەرگاڤ هەرە. **(پەندەکا ئەمریکییە)**
- پیێ خۆ ل دیف بەڕکا بابێ خۆ درێژ بکە. **(پەندەکا کوردییە)**
- مرۆڤێ هۆشمەندو ژیر ژ خەمساری و زێدە گاڤیێ دفەتسیت. **(ئائین تائۆ)**
- د سەرکەفتنێ دا ژی پێدڤییە رێکا مام ناڤنجی بوونێ نەهێتە بەردان. (؟)
- قایدە مەزاختن ژێدەرەکە ژ ژێدەرێن دەستکەفتنا پارەی. **(ئەلیکساندەر دۆما)**
- ئەو کەسێن ب داهاتەکێ کێم نەکارن هندەکێ هەلگرن، ب داهاتەکێ زۆر ژی نکارن پارەی پاشکەفت بکەن. **(نۆژدار مارتن)**
- نەهند خۆ نەرم بکە کو ب ئێکجاری بهێییە داعویران نەخۆ هند رەق بکە کو دحەفکێ دا نەچییە خار. **(پەندەکا کوردییە)**
- نەوەکی بەبەغای گۆتنا هەمی کەسا ڤەگێڕە نە وەکی بلبلی بەلاش ب خۆینە. **(سەعید نەفیسی)**
- ئەگەر قەومین و روویدان چقاس مەزن بن بەس مرۆڤ هەڤسەنگی و مام ناڤنجیا خۆ ژ دەست نەدەت دێ ب سەر وان دا هەر سەرکەڤیت. **(نۆژار مارۆن)**

- هەتا مرۆڤ حەزو ئارەزوویێن خۆ قایدە نەکەت سەرفرازو بەختەوەر نابیت. **(حەسەن عەلی راشد)**

- زێدە حەژێکرن و زێدە کەرب ڤەبوون هەردوو ب ئێشن. **(تائۆنێ کینگ)**

- پیێ خۆ زۆر نەهاڤێژە د مالا هەڤسوی و جیرانێ خۆدا نەوەکو ژ تە تێر ببیت و بێزاریا خۆ ژتە بکەت. **(؟)**

- مرۆڤێ مەزن خۆ ژ سێ تشتا دپارێزیت: شەهوەتێ ل دەمێ لاوینێ دا، شەڕخازیێ ل دەستپێکا بێ هێزییێدا، پلە خازیێ ل چاخێ پیریێ دا. **(کونفوسیۆس)**

- مرۆڤێ ژیرو تێگەهشتی ئەوە یێ کو چ داب ونەریت و رەوش و تیتال وی کەڕو کۆرە نەکەن. **(سەعید نەفیسی)**

- ئەوا کو دبیتە ئەگەرا دلگرانییا پڕانییا خەلکی بێ پارەیی نییە، بەلکی نەبوونا رێکا درۆستا مەزاختنا پارەیە. **(دیل کارەنگی)**

- ژ هێدی چوونێ نەترسە، ژ خۆش راوەستانێ بترسە. **(پەندەکا چینییە)**

- د جیهانێ دا چ زێدەگاڤی وەکی وێ زێدەگاڤیێ نییە ئەوا د دەرحەقێ ماف ناسیێ دا دهێتە کرن. **(لابرویر)**

- مرۆڤێ رەزیل دێ پترێ هژمێریت ژ مرۆڤێ مەرد. **(تائۆنێ کینگ)**

- چاوا رۆناهییا زۆر دبیتە بەربەست د هەمبەر دیتنێ دا، وەسا ژی زۆریا نیعمەتان دێ بیتە رێگر د هەمبەر تام و لەزەتاندا. **(حیجازی)**

- هەمی نەپەنییێن خۆ بۆ هەڤالێ خۆ نەبێژە نەوەکو رۆژەکێ ژ رۆژان ببیتە دوژمنێ تە، هەروەسا هەمی چەکەکی د هەمبەر نەیارێ خۆدا بکارنەئینە، نەوەکو رۆژەکێ ببیتە هەڤالێ تە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

# قەنجی و باشی

- مرۆڤێ قەنجیکار مینا زارۆکێ بێ گونەه ترس ژ کەس نییە. **(حیجازی)**
- مرۆڤ نکاریت چاکیێ دگەل هەمیا بکەت، لێ دکاریت چاکیێ نیشا هەمیا بدەت. **(رۆلن)**
- دگەل مرۆڤێن خراپکار چاکیێ بکە دا رێکێ ل خراپیا وان بگری. **(عەلی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- دگەل باشا خراپیێ نەکە، چونکی دێ رێکێ ل وان گری کو قەنجیێ بکەن. **(عەلی کورێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- مەزنترین تام تاما قەنجی کاریێ یە. **(سوواژ)**
- باشترین زەخیرە بۆ سبەهی کارێ ئەڤرویە. **(؟)**
- باشترین رێك بۆ راکێشانا باشیێ پالدانا(دفع) خراپیێیە. **(ڤولتەر)**
- ب خراپی باسێ خەلکی نەکە دا خەلك ب خراپی باسێ تە نەکەت. **(؟)**
- باشترین رێك کو کەسێن دی حەژ مرۆڤی بکەن کرنا باشیێ یە ددەرحەقێ وانادا. **(رۆسۆ)**
- ئەگەر بەختەوەری هات هەمی د باشن، ئەگەر بەدبەختی هات هەمی د خراپن. **(ئەفلاتون)**
- مرۆڤ دکاریت بەرامبەری هەمی تشتەکی یێ خۆ ڕاگربیت بەس بەرامبەری باشی و قەنجیێ نەبیت. **(رۆسۆ)**
- تشتەکێ باشە هەر شەڤ دەمێ نڤستنێ ژ خۆ بپرسم، ئەڤرو من چ خراپی کریە، من چ گۆتییە، یان من هەست ب چ کریە و من چ کارێ باش ئەنجام دایە. **(پارکەر)**

- ڕەفتارا باشا تە دێ هەڤسویەکێ باش پەیدا کەت. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- تشتێ زوی پێبگەهیت زوی دێ رزیت. **(پەندەکا ئەمریکییە)**
- پێ سوپاس کەربە دا پێ ژ هەژی قەنجییێ بی. **(پەندەکا ئیرانییە)**
- شەڕ ب شەڕی ڤەنامرییێت، هەروەکی چاوا ئاگر ب ئاگری ناتەمریت، بەلکی شەڕ ب خێر دێ ڤەمرییێت، ئاگر ژی ب ئاڤێ. **(لقمانێ حەکیم)**
- مۆم دەمێ د حەلییێت رۆناهییێ ددەتە دەوروبەران. **(پەندەکا فارسییە)**
- نەبەسە مرۆڤ کارێ باش ئەنجام بدەت، دڤێت کارێ باش ب رێکەکا دروس ئەنجام بدەت. **(جان مۆلی)**
- مرۆڤ دڤێت کێماسیا بچیك ب کێم نەزانیت، چونکی وەکی دوژمنێ بچیکە ددەمێ خۆدا دێ زیانێ گەهینتە مرۆڤی. **(ئستاهل)**
- ئەو کەسێ وەکی دۆست نەکاریت قازانجی بگەهیتە تە چێدبیت وەکی دوژمن زیانێ ل تە بدەت. **(پەندەکا هندییە)**
- کێماسیێن نەپەنێن خەلکی ئاشکرا نەکە، چونکی هەم دێ وان شەرمەزار کەی هەم دێ خۆ ژی بێ باوەڕکەی. **(سەعدی شیرازی)**
- مرۆڤێ خەسلەت باش چ جارا ب تنێ نامینتەڤە، چونکی هەر گاڤ دێ دۆستان ژ خۆرا پەیدا کەتن. **(کنفوسیۆس)**
- قەنجی ب سەر هەمی تشتادا سەردکەڤیت و ب خۆ قەت نادۆڕینیت. **(تولیستۆی)**
- قەنجی تشتەکە پتر ژ هەر تشتەکی خەلکی ژ چەك دکەت. **(لاکوردو)**
- کارێن باش مینا دایکانە رۆژ بۆ رۆژێ زاروکێن پتر ژێ پەیدا دبن. **(لورد ئاڤیبۆری)**
- قەنجی بەرامبەر قەنجییێ تشتەکێ پەسەندو هەژییە، لێ دوژمنایەتی بەرامبەر دوژمنایەتییێ کارەکێ پەسەندو هەژی نییە. **(خواجە عەبدوڵڵا)**
- هەر کەسێ بکاریت و باشییێ نەکەت دەمێ بێ هێزییێ دێ نەخۆشییێ بینیت. **(سەعدی شیرازی)**

- ئەوێ ل کێماسیێن دۆستان بگەڕیێت وەکی دوژمنایە. **(نگارستان جوینێ)**
- باشیێ بکەو د ئاڤێ دا بەردە. **(پەندەکا کوردییە)**
- دۆستێ باش ل رۆژا تەنگاڤیێ دەردکەڤیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەوێ تە دگرینیت دۆستێ تەیە، ئەوێ تە دکەنینیت دوژمنێ تەیە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەوێ دگەل نەزانی رادبیت و رویتئینیت باشیێ نابینیت. **(سەعدی شیرازی)**
- هەر کەسێ گۆمانا باش ب تە ببەت گۆما نا وی بکە راستی. **(باسیۆس)**
- ئەرکێ مەیە قەنجیکار بین نە وەکی مە دڤێت، بەلکی وەکی مە ژێ دهێت. **(؟)**
- نابیت مرۆڤێ قەنجیکارو خراپکار ل دەڤ تە مینا هەڤبن چونکی چێدبیت وە ل مرۆڤێ قەنجیکار بکەت ل سەر قەنجیا خۆیێ بەردەوام نەبیت، هەروەسا وە ل مرۆڤێ خراپکار ژی بکەت ل سەر خراپکاریا خۆ یێ بەردەوام بیت. **(عەلی کوڕێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەگەر گول نەبی کەلەم ژی نەبە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ئەوێ قەدرێ چاکیا ئێکی بزانیت دێ دەرگەهەی بۆ قەنجیکارەکێ دی ڤەکەت. **(پەندەکا ئەلمانییە)**
- ئەگەر حەز بکەی هژمارا مرۆڤێن قەنجیکار زێدە ببن کارێ خۆ بکە قەنجی کرن. **(حیجازی)**

# هۆش و ژیری

- مرۆڤێ هۆشمەند ئەگەر مارەك كوشت تێشكێ وی خودان ناكەت. **(تن)**
- مرۆڤێن هۆشمەند جانێن جڤاكێ نە. **(دانیال)**
- ئەگەر  تە بڤێت حوكمی ل دونیایێ بكەی گەرەكە عەقل حوكمی ل تە بكەت. **(سرندك)**
- مرۆڤێ عاقل ئەگەر ب خراپی باسێ وی هاتەكرن مفای ژێ وەردگریت. **(جۆرج بانە)**
- هەمی خودان دەست هەلات نەدعاقلن، لێ هەمی عاقل خودان دەست هەلاتن، عەقل ژ زێڕی بهاگران ترە، چونكی كێمترەو ب مفاترە. **(فۆشە)**
- ژ یهاتن ب هۆنەرە نە ب مال، مەزناتی یا ب عەقلی یە نە یا ب ژییە (عمر). **(سەعدی شیرازی)**
- عاقل ئەو كەسە كو كریارێن وی گوتارێن وی پشت راست بكەن. **(نەصیحەت الملوك)**
- یێ ب عاقل بە دا یێ ب هێز بی. **(قابۆسنامە)**
- مرۆڤێ عاقل ئەو تشتێ نەزانیت نابێژیت لێ ئەو تشتێ دبێژیت دزانیت. **(ئەرستۆ)**
- دوژمناتیا مرۆڤێ عاقل باشترە ژ دۆستینیا مرۆڤێ نەزان. **(پەندەكا عەرەبییە)**
- ئەگەر رۆژەكێ عاقل بهێتە كڕین و فرۆتن ئەم هەمی دێ فرۆشین، چونكی ئەم وە دزانین مە زێدە ژ خۆ یێ هەی. **(حیجازی)**
- عەقل ئەو هێزە یا دونیایێ برێڤە دبەت. **(ئێمرسۆن)**

- سەرێ مرۆڤێ عاقل چ جارا نائێشیت. **(پەندەکا ئیتالییە)**
- ئەگەر عەقل ژ مرۆڤی بهێتە ستاندن ئیدی چ تشتەکێ بهاگران ژێرا نامینیت. **(هامیلتۆن)**
- چاوا زەلام عەبدالێ دەستێ ژنێ یە، وەسا عەقل ژی عەبدالێ دەستێ نەفسێ یە. **(سەعدی شیرازی)**
- بەس مرۆڤێ عاقل دەولەمەندەکێ تڤاڤە. **(پەندەکا لاتینییە)**
- هزر ستوینا هۆشێیە. **(دهخدا)**
- ئەو کارێ کەسێ عاقل ل دەستپێکێ دکەت، نەزان هەمان کاری ل دیماهیکێ ئەنجام ددەت. **(پەندەکا هندییە)**
- زۆر جارا ئەم عەقل و دلی لێك دگوهرین، ئەو چەندا دل دخازیت دکەینە ستوینێ عەقلی. **(حیجازی)**
- عەقلێ کرمانجی پێ پاشییە. **(پەندەکا کوردییە)**
- عاقل ئەو چەندا نەزانیت نابێژیت، لێ نەزان ئەو چەندا نەزانیت دبێژیت. **(پەندەکا تورکییە)**
- هەر کەسێ عەقلێ وی ب سەر هەستێن وی دا زالببیت ب هێزترین زەلامێ سەر عەردییە. **(عەلی کورێ ئەبو تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەو کەسێن ب چاڤێ عەقلی دنێرنە راستیێن ژیانێ چ جارا ناهێنە خاپاندن. **(عەلی کورێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەزێ نەچارم وەرزشێ بکەم چونکی دێ عەقلێ من پویچ بیت. **(تۆلیستۆی)**
- ئەو کەسێ بەس د هزرا تێرکرنا زکێ خۆدا بیت عەقلێ خۆ دێ هێلیتەڤە برسی. **(پەندەکا چینییە)**
- عەقل ژ ساخلەمیێ هەژیترە، ژ بەرکو ئەگەر مرۆڤ یێ خودان عەقل بیت دێ کاریت ساخلەمیێ ب دەستڤە بینیت، لێ مرۆڤێ بێ عەقل دێ ساخلەمیا خۆ ژ دەست دەتن. **(حیجازی)**

- عاقل ئەو کەسە یێ ڤێ جیهانێ وەکی دوزەخێ حساب بکەت و پێکۆلێ بکەت نەکەڤیتە دناڤ ڤێ دۆزەخێ دا. **(ئەبۆ تالب)**

- عەقلێ بێ دلۆڤانی و سۆز یێ مەترسیدارە وە سۆزو دلۆڤانی ژی بێ عەقل جهێ متمانێ نینە، مرۆڤێ تڤاڤ ئەو کەسە یێ هەم عەقل هەبیت هەم سۆزو دلۆڤانی. **(تن)**

- چ جارا کولاڤ ناچیتە سەرێ مرۆڤێ عاقل، بەلکی هەر مرۆڤێ عاقلە کولاڤی دکەتە سەرێ مرۆڤێن شاش و نەفام. **(ج. پ)**

- ئەگەر عەقل یێ ب خورتیێ با کەس هندی بەگ و ئاغا نەدبوو. **(ج. پ)**

- رۆژەکا مرۆڤێ عاقل ژ ژیەکێ مرۆڤێ ئەحمەق باشترە. **(پەندەکا عەرەبییە)**

- ئەو جەنگ و شەڕێ عەقل تێدایێ سەرکەفتی بیت ژ هەمی شانازیەکێ مەزنترە. **(حیجازی)**

- مرۆڤێ عاقل بەس بۆ خۆ ناژیت، بەلکی بۆ خێرو چاکیا کەسێن دی ژی گەرەکە گاڤا پاڤێژیت. **(ئیسمایلز)**

- من ژ سەیدا یێ خۆ پرسی کی ژ خرا عاقلترە، گۆتە من ئەو کەسێ کێم دئاخڤیت وە زۆر گوهێ خۆ ددەتێ وە گەلەکێ دزانیت. **(بۆز جمهور)**

- خۆ ژ کەسەکی بپارێزە کو نەزانیت یێ نزانیت، وی کەسی ژی کو نەزانیت و دزانیت کو نزانیت فێر بکە، هەروەسا ئەو کەسێ دزانیت و نزانیت کویێ دزانیت هۆشیار بکەڤە. وە ئەو کەسێ دزانیت و دزانیت یێ دزانیت گوهێ خۆ بدەرێ. **(پەندەکا عەرەبییە)**

# هزر کرنەڤە

- مـــرۆڤ چــێکریێ هــزرێن خۆیـــە، ئـــەوا ســـبەهی دقــەومیت بەرهــەمێ هزرکرنەڤا دوهییە. **(مترلینگ)**
- ئەگـەر ل دۆر هـەمی تشـتەکی هـزر بکەنەڤـە هـوین نەشـێن سـەبارەت چ تشتەکی بڕیارێ بدەن. **(فرانکلین)**
- هزرێن هەر مرۆڤەکی جیهانا وینە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- هزر بکەڤە پاشێ باخڤە دا نەتەحسی. **(عـەلی کوڕێ ئـەبۆ تالـب) خـودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەوێ دگەل خۆ یێ ب تنێ بیت نەیێ تڤاڤە. **(تن)**
- ئەڵماس دنـاڤ زکـێ عەردیـدا ناهێتـە پەیـداکرن، راسـتی ژی دنـاڤ کویراتیـا هزرێدا ناهێتە ڤەدیتن. **(ڤیکتۆر هۆگۆ)**
- هزرێن ئافرندە (مبدع) مینا پێپەلانکێن پێریسکا کارەکی نـە، ب هـزرێن ئافرنـدە دێ کارین بـەرەڤ سـەری ژێهـەل بچین، هـەر چقاس پێپـەلانکێن پێریسکێ پتر بن ئەم دێ پتر ژێهەلچین. **(پستالۆژی)**
- ژ بۆ ژیانێ هزر بکەنەڤە ئەما خەما نەخۆن. **(دیل کارەنگی)**
- ئـەز چ جـارا هـزر ل رابردوویـا خـۆ ناکەمەڤـە ئـیلای چـاخێ مـن بڤێـت ئەنجامەکی ژێوەرگرم. **(نەهرۆ)**
- هــزر ل پاشــەرۆژا هــەر کــارەکی کرنەڤــە دێ بیتــە ئەگــەرێ رزگــاریێ. **(سوقرات)**
- هەمی ژێهاتن و مەزناتیا مرۆڤی یا دهزر کرنەڤا ویدا. **(؟)**

- ئاخفتنا بێ هزر کرنەڤە وەکی تیر هاڤێژەکێ بێ ئارمانجە. **(فەیلەسۆفەکێ یۆنانی)**
- هزر کرنەڤە کاکلکا بلیمەتییێ یە. **(ژان پولسارتەر)**
- روخسەتێ نەدە زمانێ خۆ کو بەری هزرکرنا تە باخڤیت. **(شیلۆن)**
- د هـزرا وێ چـەندێ دا نەبـە یـا تـەکری، د هـزرا وی چـەندێ دا بـە یـا تەهێشتا نەکری. **(سەعید نەفیسی)**
- د ناڤ زەڤیا هزرا هەوەدا زۆر خەزینێن ڤەشارتی هەنە. **(مۆلفۆرد)**
- سەبارەت هەر تشتەکێ تۆ دبێژی هزر بکەڤە، لـێ سـەبارەت هـەر تشـتەکێ تو هزر دکەیەڤە نەئاخڤە. **(فەیلەسۆفەکێ هندی)**
- دۆ هزر ژ هزرەکێ باشترن. **(پەندەکا ئەمریکییە)**
- زێدە هزر بکەڤە، کێم باخڤە و کێم بنڤیسە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- سپێدە دایکا پەیڤینایەو شەڤ دایکا هزرایە. **(پەندەکا ئیتالییە)**
- چاخێ ئاریشـێ دڤێـت هـزر بهێتـە لڤانـدن و بزڤانـدن، نـە دەمـار. **(محمـد حیجازی)**
- ژیانا مە ژ دایك بوویا هزرا مەیە. **(مارك ئوول)**
- کێم باخڤە و زۆر بزانە گول ب سەر، زۆر باخڤەو کێم بزانە ڤورٖ ب سەر. **(پەندەکا کوردییە)**
- مـرۆڤ بـەس ب رێکـا هزرکرنـەڤێ تشـتێن نـە دیـارو نەپـەن ڤـەدبینیت. **(پووکاس)**
- هزر بەرێ مرۆڤی ددەتە رێکا مانەڤێ، لێ بێ هزری بـەرێ مرۆڤـی ددەتـە مرنێ. **(بۆدا)**
- من هزرا خۆ دا شۆلێ د ئەنجام دا رێك بۆ من هاتە ڤەکرن. **(بۆدلەر)**
- ئەوێ کێم هزر بکەتەڤە زۆر د ئاخڤیت. **(پەندەکا فەرەنسییە)**

- ئـەو كەسـێ بـێ هزركرنەڤـە د ئاخڤيـت مينـا وی نێچـيرڤانييە يـێ بـێ سێرەگرتن تڤەنگا خۆ د شەڤينيت. **(منتيسكيو)**

- هـزرا بـاش سامانەكە ناكەڤيتـە دەسـتێ ڤـی و يـێ هـەنێ و هـەر گـاڤ دێ تامكەينە بەرهەمێ وێ يێخۆش. **(لورد ئاڤيبوری)**

- چـێدبيت گـورگ كـەڤلێ خـۆ بگۆڕيـت لـێ هـزرا خـۆ ناگوڕيـت. **(پەنـدەكا يوگسلاڤييە)**

- وەكـی زەلامـێ شـولكەر هـزر بكەڤـەو وەكـی زەلامـی هزركـەر شـول بكـە. **(هانری بركسن)**

- باوەر نەكرن و درەنگ باوەركرن هندەك جارا نيشانێ هشياری و ژيرييێيە. **(؟)**

- جوداهی دناڤبەرا هزركرنەڤێ و كاركرنێ دا نييە. **(چەرچل)**

- هەر چقاس پتر هزر بكەينەڤە باشتر دێ زانين كو ئەم چ نزانين. **(ولتەر)**

- هـەر هزرەكـا هـەژی و شايسـتە جـوانيێ دبەخشـيتە رووبمـەتێ مرۆڤـی. **(روسكين)**

- هيچ لـێ نێرينـەكێ وەكـی لێنێرينـا هـزرو كريـارێن مـە پەنـد ژێ ناهێنـە وەرگرتن. **(محەمەد حيجازی)**

- هـەر چـەرخەكی نەسـاخيەكا هـەی نەسـاخيا ڤـی چـەرخی ژی نەخۆشـيا هزرێ و دلتەنگيێ يە. **(ديل كارەنگی)**

- بهاگرانترين هزر ئەو هزرە يا دشێت دەرگەهێ ئاريشا ڤەكەت. **(ج.پ)**

- هزر چێدبيت ل ديڤ رەنگ وجۆرێ خـۆ لەشـی نەسـاخ و لاواز بكـەت يـان ساخلەم و ب هێز بكەت. **(مولفۆرد)**

- هەتا جهێ پيێ خۆ نەبينی گاڤا خۆ نەهاڤێژە. **(پەندەكا كوردييە)**

- ئـەو كەسـێ كـو هـزرا پاشـەرۆژی نەكـەت و ل ئايەنـدێ نـەنێرِيت بكێـر دۆستينی و هەڤالينيێ ناهێت. **(؟)**

# هێزو دەست هەلات

- هـەر جهـەکی هێـز تێـدا بـۆ خـودان دەسـت هـەلات یاسـا دێ لاواز بیـت. **(ناپلیۆن)**
- دان (اعـتراف) ب هەلـەو شاشـیا خـۆ کـرن لاوازی نییـە بـەلکی ب هێزییـە. **(ئوژن بێتان)**
- هەر گاڤا مە هەست ب خالێت لاوازو ب هێزێن خۆ کر دێ بۆ روی ب روی بۆنەڤێ د بەر هەڤ و ئامادەبین. **(پارکەر)**
- ئەگـەر تـۆ ژ کەسـەکێ لاواز تورەبـووی بەلگەیـە ل سـەر وێ چـەندێ کـو تۆنەیێ ب هێزی. **(ولیام چیمس)**
- ب هـەمی رێکـا خـۆ ژ مرۆڤـێ خـودان دەسـت هـەلات بپـارێزە. **(پەنـدەکا ئەفریقییە)**
- ئەگـەر تـۆ نـەکاری لـەڤا پاڤێـژی ددانـێن خـۆ نیشـان نـەدە. **(پەنـدەکا ئینگلیزییە)**
- ل دەڤ هەر کەسەکێ لاواز هێزەکا هەی، هەروەسا ل دەڤ هـەر کەسـەکێ ب هێز لاوازیەکا هەی. **(حیجازی)**
- بێ دەنگی مەزنترین هێزە. **(پەندەکا ئەفریقییە)**
- مرۆڤێ خودان هێزو سیلاڤ (شلال) هەردوو رێکـا خـۆ ڤەدکـەن. **(پەنـدەکا ئینگلیزییە)**
- هێز یا دهێرشبرنێ دا هاتییە ڤەشارتن نە د بەرەڤانیکرنێدا. **(؟)**
- هێز ب کیش دەستی ب خۆت دێ ژەهراویکەتن. **(شیللەر)**

- ئەو کەسێ هێزێ ب پارە بکڕیت، دێ دادپەروەریێ ژی ب پارە فرۆشیت. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- ئەو کارێ گورگ ب خورتی ئەنجام ددەت، رویڤی ب فێل و حیلە دکەت. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- هەڤڕکی هێزێ چێدکەت نە پالڤەدان. **(ئستاهل)**
- ئەم زۆرترین جارا ئێمناهی و ساخلەمی و هەتا ڤیانێ ژی دکەینە گوری دەست هەلاتێ. **(محمد حیجازی)**
- ئەرکێ شەنگستی یێ پەیڤا دەست هەلاتێ ئەوە کو درێکا بەختەوەرکرنا مرۆڤایەتیێ دا تێ بکۆشیت. **(هانری دورلنان)**
- فەرە هەمی خودان دەست هەلات ڤی شیرەتی بکەنە گوهان کو هەڤڕك و دژێن خۆ ب خورتی و هێزێ ژ گورەپانێ دەرنەئێخن. **(تورگەر)**
- کەسێ دار برِ بەری پێدڤی ب شیان و هێزێ هەبیت پێدڤی یا ب شارەزایێ هەی دا خۆ بریندار نەکەت. **(هومەر)**
- مرۆڤێ مەزن ئەگەر ببیتە کەر لێ سیار نەبە. **(پەندەکا کوردییە)**
- برسیێن دەست هەلاتێ چ جارا تێر نابن. **(ج. پ)**

# هەژاری و دەست تەنگی

- خراپترین رەوش کو مرۆڤ بکەڤیتە تێدا هنگییە کو یێ تەپەسەرو دەست تەنگ بیت. **(رۆسۆ)**
- نڤستن خەزینا مرۆڤێ هەژارە. **(پەندەکا لاتیڤییە)**
- یێ دادپەروەر (عادل) بە بلا گەدا بی. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- ئەگەر هەژاری هاتە دەرگەهی ڤیان دێ دپەنجەرێ را رەڤیت. **(علی کوڕی ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- هەژار بۆ تێرکرنا زکێ خۆیێ د عەزابێ دا، دەولەمەند ژی بۆ چارەسەرکرنا ئاریشێن خۆ یێ د عەزابێ دا. **(فرانکلین)**
- هەژاری زەلامی دووچارێ تاوانکرنێ دکەت وە ژنێ بۆ ئالێ دامان پیسیێ پالددەت. **(هۆگۆ)**
- هەژار نە ئەوە یێ کێم هەی، بەلکی ئەوە یێ زۆرێ دخازیت. **(سنکا)**
- هەژار ل هندەك خۆشیێن دونیایێ یێ زڕ بەهرە، لێ رەزیل ژ هەمیا یێ زڕبەهرە. **(لابرویەر)**
- هەژاری خراپترین دەرگەڤانێ دامان پاکیێیە. **(پەندەکا کوردییە)**
- هەژاری هەمی ڤەنجیەکێ ژ ناڤ دبەت. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- هەژاری رێکا ڤەنجی و خۆ پارێزیێ ڤەپات دکەت. **(پەندەکا لاتینییە)**
- ڤەرداری خۆرکا ژیی (عمر)یە. **(پەندەکا ئیتالییە)**

- قەرداری عفریتەکە ئەگەر سبەرێ لتە بکەت ناچیت و ناچیت. **(پەندەکا رۆسییە)**
- شەرمینی بۆ کەسێن محتاج و نیازمەند کارەکێ نەباشە. **(ئەفلاتۆن)**
- ئەو کەسێ پێ هەبن و خازخازوکیێ بکەت پیێن وی دزێدەنە. **(پەندەکا عەرەبییە)**
- خازخازۆك هەر چقاس حەفکا خۆ خار بکەت پتر درەووان دکەت. **(پەندەکا ئسکۆتلەندییە)**
- دایکا هەر عەیب و عارەکێ هەژاری و بەلەنگازییە. **(رۆسۆ)**
- هەر تشتێ تەنگێن مە بشدینیت دێ بێژین ئەڤە بەخت و شانسە. **(ئەمرسۆن)**
- هەیی بە کوڕێ کەریبە. **(پەندەکا کوردییە)**
- بمرە بەس یێ خازخازۆك نەبە. **(پەندەکا فەرەنسییە)**
- پاریەکێ نانی نە تشتەکێ گرنگە لێ بۆ گەرۆکەکی کو ژ برسادا بمریت هەمی تشتەکە. **(جۆرج سودیت)**
- باشترین یاسا بۆ نەهێلانا برسێ و هەژاریێ دادپەروەریە. **(ج. پ)**
- جۆداهی دناڤبەرا کەسێن دزو دەولەمەند ئەوە، هندی دزن پارێ دەولەمەندا ددزن، هندی دەولەمەندن پارا هەژارا دبەن. **(برناردشۆ)**

# هیمەت بلندی

- بهاو رێزا هەر کەسەکی ل دیڤ ئەندازێ هیمەتا وییە. **(علی کورێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- ئەگەر تشتەکی بدەیە دوژمنان باشترە نەوەکو ژ دۆستان بخازی. **(؟)**
- مرۆڤێ هیمەت بلند چ جارا دناڤ چەپ و چویرێن ژیانێ دا دووچارێ بێ ئومێدییێ نابیت. **(ناپلیۆن)**
- زەلامێ هیمەت بلند هەتا بلند نەبیت ناڕوینیتە خارێ. **(کلیلە و دۆمینە)**
- هیمەت ئەوە کو چ رویدان و قەومین نەبنە رێگرو سنگەبەر درێکا پێشڤەچوونێدا. **(ئیبن عەتا)**
- نانێ خۆ ب خۆ ب ئاڤێ منەتا خەلکی پاڤێ. **(پەندەکا کوردییە)**

# یاسا

- بهاو گرانیا هەر حکومەتەکێ یا گرێدایە ب وان کەسان ڤە ئەوێن وێ حکومەتێ پێکدئینن. **(جان ئستیوان سیل)**
- وەسا رەفتارەکا هەژی و شایستە بکە کو ئەو رەفتارا تە ببیتە یاسایەك بۆ دیڤراچوونێ. **(پیتۆلێ ئەلمانی کانت)**
- دگەل وا کەسێن دبن دەست هەلاتا تەدا یێ دلۆڤان بە دا دووچارێ گورزا دوژمنێ نەبی. **(سەعدی شیرازی)**
- بێی هەبوونا حکوومەتاکا هەلبژارتی مەحالە جڤاك بەرەڤ کەمالێ بچیت. **(هربرت ئسپینەر)**
- تاوانێ نەکە دا نەترسی. **(ئازەرمار پەسندان)**
- بۆ هندێ نەکەڤییە بەرامبەری ڤازی دیڤ یاسای را هەرە. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- باشترین تەرزێ دەست هەلاتێ زالبوونە ب سەر دلاندا. **(ناپلیۆن)**
- هەر جهەکێ یاسا هاتە دائێخستن دەرگەهێ زۆری و ستەمێ دێ ڤەبیت. **(ڤیلیام پیت)**
- جادا یاساو دەستۆری یا درێژە، لێ جادا سەربۆرو سەرمەشقێ یا کورتە. **(سەنك)**
- بۆ سەر چیایێ مەزناتی و دەست هەلاتێ ژێهەل چوون کارەکێ سەختە، لێ هاتنە خار کارەکی ب ساناهییە. **(ریواردل)**
- داب و نەریت ژ یاسای ب هێزترن **(؟)**
- یاسا مللەتی چێناکەت، مللەت یاسای چێدکەت. **(پەندەکا ئیگلیزییە)**
- یاسا د هەمبەر ستەمێ دا خۆ خرڤە دکەت. **(پەندەکا لاتینییە)**

- ئەو کەسێ دناڤ دام و دەزگەهێن حکومەتێ دا کار دکەت دڤێت ب خەلکی ڤە یێ گرێدای بیت. **(تۆماس جفرسن)**
- کێماسیا مەزنا دیکتاتۆریەتێ ئەوە دڤێت ب چەکۆچێ هێزێ کورسیکا خۆ یا دەست هەلاتێ بپارێزیت. **(لۆدریك)**
- یاسا هەر گاڤ کێلبێن خۆ نیشان ددەت، لێ لەڤا ناهاڤێژیت. **(پەندەکا ئینگلیزییە)**
- ئەو بڕیارا ب خوینێ دهێتە مۆرکرن دێ ب خوینێ ژی هێتە ڤەڕشاندن. **(پەندەکا لاتینییە)**
- ئەوێ نەشێتە خۆ نەشێتە کەس. **(ئشتال)**
- ئەوێ ل دەڤ تە ژتە بترسیت، چاخێ ل دەڤ تەچوو. ژتە یێ بێزارە. **(پەندەکا ئیتالییە)**
- مللەتا دۆ دژمنێن بترسێن هەی، دوژمنێ ئێکێ ئەوە یێ یاسای دبن پیێن خۆدا دگەڤزینیت، یێ دوویێ ئەوە یێ ڤی کەسی دبینیت لێ خۆ کرو بێ دەنگ دکەت. **(موندڤیل)**
- ئێکەمین ئەرکێ دەست هەلات داری بەرقەرارکرنا دادپەروەریێ یە. **(ناپلیۆن)**
- ئەگەر سویجبار بۆ قازی فاتیحا یاسای هاتە خاندن. **(پەندەکا چینییە)**
- هەرگاڤ یێ ئاشتی خازبە، لێ یێ بەرهەڤی شەڕی بە. **(ناپلیۆن)**
- هەر کەسەك چقاس یێ لاواز بیتن دێ کاریت حوکمی ل خۆ بکت. **(پەندەکا یۆنانییە)**
- هەر کەسێ سیارێ پلنگی بوو زەحمەتە بکاریت ل سەر پشتا وی بهێتە خارێ. **(پەندەکا چینییە)**
- هەر نەتەوەکی حکومەتەکا هەی کو یێ ژ هەژی وێ بیت. **(علی کوڕێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**
- بلا دز دەستا کورت نەکەن، دا دەستێن وان نەهێنە کورتکرن. **(سەعدی شیرازی)**
- هەر سەرۆکەکێ شەڕابا دەست هەلاتی ڤەخوار نکاریت پێ سەر خۆش نەبیت. **(تن)**
- سکالا یا خۆ ل دەڤ کەسەکی بکە کو بکاریت ئاریشا تە چارەسەر بکەت. **(علی کوڕێ ئەبۆ تالب) خودێ ژێ ڕازی بیت**

# هەمی رەنگ

- ئەگەر خزمێ مرۆڤی گۆتە مرۆڤی ستێ، خەلك دێ بێژیتە مرۆڤی زتێ. **(پەندەكا كوردییە)**
- پیرەژنێ حەوجە بوومێ ب سویژنێ. **(پەندەكا كوردیە)**
- ئاگری ب دارێن هویر هەلكە. **(پەندەكا كوردییە)**
- بەرتیل بەرا نەرم دكەت. **(پەندەكا كوردییە)**
- ئەگەر كەر كەفت كەس ژ خودان فەرتر نییە راكەتەڤە. **(پەندەكا كوردییە)**
- مرۆڤێ بیانی بدەیێ گۆشتێ رانی تۆ هەرێ پشێمانی. **(پەندەكا كوردییە)**
- ئەگەر پیرا ب نڤێژبیت سالا بەردرێژە. **(پەندەكا كوردییە)**
- چ نەدیتیا چ نەدیت دەما دیت ب خۆ ڤەڕیت. **(پەندەكا كوردییە)**
- هەرچی نە ل گۆڤەندێ خۆش داوەتییە. **(پەندەكا كوردییە)**
- هەر كەسێ نەگۆت و كر ئەو مێرە، یێ گۆت و نەكر ئەو كەرێ نێرە. **(پەندەكا كوردییە)**
- تڕانە دبنە مژانە. **(پەندەكا كوردییە)**
- خۆلی ل وی سەری ئەوێ گا دایە ب كەری. **(پەندەكا كوردییە)**
- خەوا باب كوشتیان دهێت،خەوا زك برسییان ناهێت. **(پەندەكا كوردییە)**

- دەوارا نەکرە ل نیسانێ و ژنا نە بژێرە ل دیلانێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- دیسکا کاڤانی بشکێنیت دەنگ ژێناهێت. **(پەندەکا کوردییە)**
- دارێ ستویر نابیتە گۆپال. **(پەندەکا کوردییە)**
- رە دبن بۆست لێ نەیار نابن دۆست. **(پەندەکا کوردییە)**
- سەرێ کەچەل دبن کۆمیدا یێ قەنجە. **(پەندەکا کوردییە)**
- وریس سەد گەزبیت ئەسلێ هێچکە. **(پەندەکا کوردییە)**
- سویارێ خەلکی هەرێ پەیایە. **(پەندەکا کوردییە)**
- فرا مریشکێ کادینە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ڤینا دلا ب دانا دەستا دیارە. **(پەندەکا کوردییە)**
- کەر ئبلیسە دەرمان وەریسە. **(پەندەکا کوردییە)**
- کێ ترکر غەریبێ گوندی. **(پەندەکا کوردییە)**
- کچا قەرەچ نابیتە خاتوین. **(پەندەکا کوردییە)**
- کەرا نەمرە هەتا پیڤێر تێت. **(پەندەکا کوردییە)**
- گرارا رۆهن ژ کێم دانییە. **(پەندەکا کوردییە)**
- کو گورگ پیر بوو دبیتە قەشمەرێ سا. **(پەندەکا کوردییە)**
- لێڤ ژ ددانا پێشترن. **(پەندەکا کوردییە)**
- مار نابت یار. **(پەندەکا کوردییە)**

- مر کەرێ قازی خەلك چوون تازی، قازی ب خۆ مر، کەسێ پرسیار نەکر. **(پەندەکا کوردییە)**
- ماسی دناڤ گولادا نابن حویت. **(پەندەکا کوردییە)**
- حەقی دبن نەحەقی ڤە ترِەترِە. **(پەندەکا کوردییە)**
- نەبەرا گێرِکە نە بەرانا خێرکە. **(پەندەکا کوردییە)**
- هەڤالێ پاری ناچیت هاری. **(پەندەکا کوردییە)**
- گۆتە هێسترێ ناڤێ بابێ تە چیە؟ گۆت ناڤێ دایکا من ماهینە. **(پەندەکا کوردییە)**
- یان نانێ تە گەنم یان زارێ تە گەنم. **(پەندەکا کوردییە)**
- ژ کەری وەرە ماکەر حۆرییە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ژ دێرێ بی و نەگەهشتە مزگەفتێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- قوین فرە تامناکەنە گەردەن زەرا. **(پەندەکا کوردییە)**
- سەرێ دۆ بەرانا دقازانەکێ دا ناکەلیت. **(پەندەکا کوردییە)**
- چویڤێ ستویر یێ ژ بەهەشتێ هاتی. **(پەندەکا کوردییە)**
- تربا(قەبر) سیارا یا کۆلایە. **(پەندەکا کوردییە)**
- ب گۆتێ نەرِابە لۆتێ. **(پەندەکا کوردییە)**
- بەرێن بەستا بای برن تۆ هەرێ ل کەنگرپەرِا دچی. **(پەندەکا کوردییە)**
- دراڤێ سپی بۆ رۆژا رەشە. **(پەندەکا کوردییە)**
- بەرخێ نێر هەر بۆ کێرێیە. **(پەندەکا کوردییە)**

- عاقلێ سڤك بارێ گرانه. **(پەندەکا کوردییه)**

- دونیا دەوورانه گاڤان حاکمەو حاکم گاڤانه. **(پەندەکا کوردییه)**

- دل وەزیره ئەما مێشك گەنجینه و میره. **(پەندەکا کوردییه)**

- دۆست و هەڤال مینا فێقی نه هەر ئێکی تاماخۆ هەیه. **(پەندەکا کوردییه)**

- مرۆڤێ زۆردار چقاس یێ شرین بیت خوینا وی هەرا تاله. **(پەندەکا کوردییه)**

- گولك ب وریسیڤه دهێته گرێدان، لێ مرۆڤ ب سۆزو پەیمانێ ڤه دهێته گرێدان. **(پەندەکا کوردییه)**

- پیەکێ هەسپی رەنجه ئێك گەنجه. **(پەندەکا کوردییه)**

- ئەوێ عەقلێ وی د چاڤان دا بیت بەس جوانیێ دبینیت. **(پەندەکا کوردییه)**

- هەمی گولك نابنه گا وه هەمی وەزیر ژی نابنه شا. **(پەندەکا کوردییه)**

- دەولەمەند کەبابان دخۆن، هەژار دویکێلا وان هەلدمژن. **(پەندەکا کوردییه)**

- کو مار پیر بوو بەق دێ لێ سیاربن. **(پەندەکا کوردییه)**

- پیستێ سەی ب دەباغێ تازه نابیت. **(پەندەکا کوردییه)**

- دیرۆك شیرەتکارێ دەست هەلات دارایه. **(کارلایل)**

- ڤەخاندن مینا برێڤه چوونێیه ،لێ نڤیسین مینا بلند بوونێیه. **(مارتن)**

- پێدڤییه مشورەت دگەل دوژمنی ژی بهێتەکرن دا ئاستێ دوژمنکاریا وی دیار ببیت. **(سوقرات)**

- ئەگەر تە بڤێت كارەكی ب باشی ئەنجام بدەی پرسیارا سێ كالا بكە. **(پەندەكا چینییە)**
- مرۆڤێ پیر مینا بیرێ یە چقاس ئاڤێ ژێ بینیە دەرێ تڤاڤ نابیت. **(ج. پ)**
- مشورەتێ دگەل هزار كەسان بكەو نە پەنییا خۆ بۆ ئێكی بێژە. **(پەندێن دێهخۆدا)**
- ئەوێ مشورەتێ دكەت ب خۆ دكەڤیتە دناڤ تەنایێ داو بۆ كەسێن دی دبیتە بناسا ماندی بوونێ. **(حەكیم)**
- هەر كەسێ دگەل زانایەكی مشورەتێ بكەت دووچاری شەرمەزاریێ نابیت. **(؟)**
- نەوێرا كەری هاڤرداڤ كورتانی. **(پەندكا كوردییە)**
- بۆ مرۆڤێ كەچەل كولاڤ دەرمانە. **(ج.پ)**
- بزن جهێ شەڤێ خۆش دكەت. **(پەندەكا كوردییە)**
- زمانێ درێژ بەلا سەرێ خودانییە. **(پەندەكا كوردییە)**
- ئەجەلا بزنێ هات نانێ شڤانی خار. **(پەندەكا كوردییە)**
- ب گولەكێ بهار ناهێت. **(پەندەكا كوردییە)**
- چرایێ درەووكەری رۆناهیێ نادەتن. **(پەندەكا كوردییە)**
- ئەو كەسێ شیرڤێبیت نابیت ل شێری بترسیت. **(پەندەكا كوردییە)**
- هەسپ سیارێ خۆ ناس دكەت. **(پەندەكا كوردییە)**
- ئەڤ مرییە یێ ژ هەژی ڤێ گرییێ نییە. **(پەندەكا كوردییە)**
- چارەسەریا بێ چاران بەس هەدارە. **(پەندەكا كوردییە)**

- ئەگەر نەبییە گورگ سە دێ تە خۆن. **(پەندەکا کوردییە)**

- مرۆڤێ بێ تورەو شەرەم یێ بێ هەڤسارە. **(پەندەکا کوردییە)**

- مرۆڤ ئەگەر خودانێ هزرەکا هوشیارو یێ خودان عەقل و وژدان بیت چ جارا سەخمەراتی وێ چەندێ خۆ لبەرچاڤان مەزن بکەت کەسێن دی کچکەو ناڤ خراپ ناکەت. **(؟)**

- ناڤ خۆشی رەڤینە ئەگەر بەدناڤی دیڤرا بهێت و هەتا هەتا دگەل مرڤی بمینیت. **(ناپلیۆن)**

- ترس و فەتسین مەزنترین بناسا شکەستنا هەر کەسەکی و هەر مللەتەکییە و ژ گورەپانێ ڤەکشیان نیشانەکێ سەرەکی یێ ترسێ و دەستپێکا شکەستێ یە. **(گونترگراس)**

- کانیەك بە، دلۆپەك نەبە. **(؟)**